رۆمان






عەتا محەمەد

# ڕێبەری کتێبسازە کوژراوەکان

## عەبدولخالق خەونی بە کتێبێکی ترەوە دەبینی

وەک هەمیشە بۆ ئاسیا، ناوێک بۆ هەمیشە دەژی.

# پێڕست

# سەرلەبەیانیی ١١ی سێپتەمبەر

هەر کەسێک ساتێک لە ژیانیدا هەیە، بێئەوەی بەخۆی بزانێت، هەستدەکات قورسایی کەم دەبێتەوە و سووک دەبێت. ئەم سووکێتییەش پەیوەندی بە جەستەوە نییە، ئەوەندەی تەم و غوبارێکی نیشتوو لەسەر ڕۆح لادەچێت. وەک ئەو پەڕەی لە باڵندەیەک بەردەبێتەوە و شنەبایەک سوک سوک بەرەو لایەکیتری دەبات. یاخود بۆ ماوەیەکی زۆر لەنێوان ئاسمان و زەویدا دەمێنێتەوە، تا لە جێگایەکی دوور دەکەوێتە سەر زەوی. ئەم بەیانییە مریەم وابوو، وەک پەڕێک بەدەم شنەباوە، چارەنووسی بەرەو ئاڕاستەیەکیتر دەڕۆیشت. بەوپێیەی هەستی دەکرد لەشی سووکترە و حەزی نەدەکرد وەک هەر ڕۆژێکیتر، کە لە ماڵەوەیە و ناچێتە سەر کار، تا درەنگ لە جێگادا بمێنێتەوە. وەک ئەوەی هێزی کێشکردنی زەوی لەسەر جەستەی کەم بووبێتەوە و نە لەسەر زەوی بێت، نە لە ئاسمان.

کاتێکیش شێرکۆ بەو بەیانییە، بەدەم هەڵگرتنی کوپە قاوەکەی و گوێگرتن لە هەواڵەکانی کەناڵێکی کوردی، درێژەی بە قسەکانیدا و وتی: کوردبوون شتێک نییە وەک تەماتە، یاخود باینجان وابێت، بەڵکوو لای هەریەکەمان مانایەکی هەیە. بۆ نموونە لای سواڵکەرێک، ئافرەتێکی لەشفرۆش و بازرگانێک، وێنەی جیاوازی هەیە و ناکرێت ئەوانە هەر هەموویان یەک وێنایان بۆ کوردبوون هەبێت... ئەوکاتە مریەم لە مێزی نانخواردنەکە دوورکەوتبوەوە و گەیشتبووە ژووری نووستنەکە

و بەساردییەکەوە ئاوڕی دایەوە، هەرئەوەندەی سەری لە دەرگاکەوە دیاربێت، وتی: ئەو فەلسەفانە بۆ خۆت هەڵبگرە، چونکە من ئەمڕۆ لێت جیادەبمەوە و نامەوێت بتبینمەوە. بەدوای ئەو قسەیەدا، دەرگاکەی داخست و ئاگای لەوە نەبوو، شێرکۆ قاوەکە دەبات بۆ دەمی، یاخود هەر لە بۆشاییدا ڕایدەگرێت. یاخود ڕاستتر هیچ بۆی گرنگ نەبوو، هەرچۆن پەرچەکرداری شێرکۆشی بۆ گرنگ نەبوو، بەوەی چی دەڵێت. بەڵکوو بە لەش سووکییەوە دوای ئەوەی دەرگای ژووری نووستنەکەی بە کلیل داخست، بەرەو ئاوێنەی خۆگۆڕینەکە ڕۆیشت و کەمێک لە خۆی ڕاما. دواتر دەستی بە داکەندنی جلەکانی کرد، کە عەزییەکی پەمەیی تەنک بوو. ئەگەرچی کەمێک دوودڵ بوو لە داکەندنی ستیان و مایۆکەی، بەڵام بەو هەستی سووکێتییەی هەیبوو، ئەوانیشی داکەند و بە ڕووتی بەرانبەر خۆی وەستا. لەوکاتەدا گوێی لە زەنگی تەلەفوونەکەی بوو، بەڵام نەیویست دەستبەرداری ئەو هەستە خۆشەی خۆی ببێت، کە وەک پەڕێک وابوو لە بۆشایی ئاسماندا و وەڵامی تەلەفوونەکەی نەدایەوە. چونکە گومانی کرد شێرکۆ بێت. پاشان هەردوو دەستی خستە ژێر مەمکەکانی و کەمێک بەرز و نزمی کردنەوە. ئەگەرچی مەمکی کەمێک گەورەتر دیاربوون لەچاو مەمکی ژنانی هاوتەمەنی و هەمیشە سەرنجی کەسانیتریان ڕادەکێشا، بەتایبەت کاتێک دەچوو بۆ هۆڵی مەلەکردن، دەیبینی چۆن سەرنجی پیاو و ژنان ڕادەکێشن، بەڵام ئەم بەیانییە هەستی کرد سووکترن لە جاران. هەموو شتێک سووکتر بوو لە ڕۆژانیتر. پاشان کەمێک جوڵا و لەلاوە سەیری سمتی خۆی کرد و لەو چەمانەوە نەرمەی پوانی، کە لە خوارووی پشتییەوە وردە وردە دەستپێدەکات. بەهێواشی دەستی پێدا هێنان، تا گەیشتنە سەر ڕانەکانی و بزەیەکی کرد. وەک ئەوەی بیر لە دوێنێ عەسر بکاتەوە، کە هەر دوای ئەوەی لە کارەکەی گەڕایەوە، ئەگەرچی هیلاکیش بوو، بە شیلە کەوتە لێکردنەوەی

مووی لەشی و تا نزیکی ئێوارەی خایاند. بەڵام ئەو هەستەی ئێستا هەی بوو، پەیوەندی بەو موو هەڵگرتنەوە نەبوو، بەڵکوو ئەو بەدرێژایی شەو نەنووستبوو تا گەیشتبووە ئەو بڕیارەی بەیانی بە شێرکۆ بڵێت دەمەوێت جیاببینەوە. ئەگەرچی چاوەڕوانی ئەو بێدەنگییەی شێرکۆی نەدەکرد. بەخۆی وت: کێ نالێت ئەویش هەمان ئەو هەستەی منی نییە و ئێستا ئەویش خۆی وەک پەڕێک نابینێت لە هەوادا.

شەو پێش ئەوەی بەیەکەوە بنوون، مریەم هەموو جلەکانی داکەند و لەژێر ڕووناکیی کزی گڵۆپەکەدا بەڕووتی پاڵکەوت. ئەگەرچی شێرکۆ کەمێک ماندوو دەبینرا و زۆر نەبوو کۆمپیوتەرەکەی کوژاندبووەوە و ئەو کۆمەڵە کاغەزەشی کۆکردەوە و ڕێکیخست، کە ماوەیەکە خەریکی نووسینە تیایاندا، بەڵام پاش ماوەیەک و دوای ئەوەی ئەو بۆنە فێنکەی لەشی مریەم بەژوورەکەدا بڵاوبووەوە و گەیشتە ئەم، ڕووی تێکرد و دەستی خستە سەر مەمکی و بەهێواشی یاری پێکردن. شێرکۆ زۆرجار باسی بۆنی مریەمی کردبوو، پێی وتبوو بۆنێکی فێنک لە لەشییەوە دێت. مریەمیش ڕاهاتبوو لەوەی هەرگیز بۆنی قورس و گەرم بەکارنەهێنێت و هەرجارێک بچووایەتە دووکانی بۆن فرۆشییەوە، زۆر بەدوای ئەو بۆنانەدا دەگەڕا، کە هەستی فێنکییان دەبەخشی. هەرچۆن نەیدەهێشت بۆن عەرەق لە بن باڵ و ناو ڕانییەوە بێت، چونکە دەیزانی شێرکۆ بەو بۆنە بێزاردەبێت و خۆی دوور دەگرێت. ئەوکاتەی سووڕی مانگانەشی بۆ دەهات، بەدزییەوە بۆنی خۆی دەکرد، یاخود هەر کە دەگەیشتە ماڵەوە، خۆی دەشۆرد. ئەم بۆ خۆشی بەو بۆنە بێزاردەبوو، کە لە هەندێک ئافرەتەوە دەهات، بەتایبەت ئەو ژنە ڕووسییە قەڵەوەی ساڵانێک لەمەوبەر پێکەوە نیشیان دەکرد و هەموو مانگێک ئەم چەند ڕۆژێک، تا ئەو لە سووڕی مانگانەکەی دەبووەوە، لەکاتی ئیشدا بێمیزاج دەبوو، یاخود هەندێکجار بۆنی لەشی، ئەمی تووشی ژانەسەر دەکرد.

مریەم وا هەستی دەکرد زەمەن لەو ساتی پێکەوەبوونانەدا و ئەوکاتەی لەگەڵ شێرکۆدا دەنوێت، کورت دەبێتەوە یاخود دەوەستێت. وەک ئەوەی زەمەن لەگەڵ خێرایی جووڵە و باوەش پێداکردن و دەستگێران بە لەشی یەکدا، خاوببێتەوە. مریەمیش زۆرجار لەدوای جووتبوونیان و لاچوونی شێرکۆ و سڕینی لەشی، یەکسەر سەیری کاتژمێرەکەی تەنیشتی خۆی دەکرد، وەک ئەوەی بیەوێت بزانێت زەمەن وەستاوە یا نا. بەڵام ئەمجارە جیاواز لە هەموو جارێکیتر، ئەوکاتەی شێرکۆ بەدەنگێکی خنکاوەوە وتی: ماریا یەک تۆز قاچت بەرزکەرەوە... هەموو شتێک وەک شکانی باڵەخانەیەکی شوشە، لە مریەمدا شکاو هاڕەی کردە خوارەوە. ئەگەرچی مریەم بۆ ساتێکی کەم ویستی خۆی گێل بکات، بەڵام ئەو لەگەڵ بیستنی ناوی ماریا، گەڕابووەوە ناو زەمەنی ئاسایی و نەیتوانی لەو ساتە ئەفسوناوییە بەردەوام بێت. هەربۆیە بێئەوەی هیچ بڵێت، سوک پاڵی بە شێرکۆوە نا، خۆی لەژێری دەرکرد و چەرچەفەکەی لە خۆیەوە ئاڵاند. بێئەوەی سەیری شێرکۆ بکات، کە تا ماوەیەکی کەم بە بێدەنگی چاوەڕوانی کرد. بەڵام دواتر هیچی نەوت و ئەمیش لەسەر جێگاکەی خۆی ڕاکشا.

مریەم پشتی کردبووە شێرکۆ و سەیری دیوارەکەی بەرانبەری دەکرد و نەیدەویست بگری، کاتێک بیری لەوە دەکردەوە، دەبێت ماوەی چەند بێت، شێرکۆ وەک ماریا لەگەڵیدا نووستبێت. یاخود دەیویست خۆی دڵنیابکات کە ماریا تەنها ناوێک بێت و شێرکۆ بەدەمیدا هاتبێت. بەڵام دەشێ ئەوە لە هەرکاتێکیتردا ئاسایی بێت، جگە لەناو جێگادا. ئەم بۆی گرنگ نەبوو ماریا کێیە، ئەوەندەی بیری لەوە دەکردەوە خۆی لە کەیەوە لە خەیاڵی شێرکۆدا، بۆتە ماریا و وەک مریەم لە شێرکۆدا مردووە. ئەمەش زۆر برینداری دەکرد. وەک ئەوەی چەند وەختە لای شێرکۆ خۆی نەبووبێت و کەسێکیتر بووبێت. بەدرێژایی شەو نەیتوانی

بنووێت. هەرجارێک دیمەنی شێرکۆ دەهاتەوە بەرچاوی، کە لە کاتی جوتبووندا چاوی دەنوقاند، وا هەستی دەکرد هەموو ئەو جارانە شێرکۆ سێکسی لەگەڵ وێنەیەکیتردا کردبێت، کە لە خەیاڵیدا بووە، نەوەک لەگەڵ ئەمدا.

لەبەردەم ئاوێنەکەدا دەستی بە لەشی خۆیدا دەهێنا و سەیری خۆی دەکرد، وەک بیەوێت دڵنیابێت لەوەی ئەم خۆیەتی نەوەک ماریا. بڵێی ئاوەکان بمانکەن بە کەسێکیتر؟

***

شێرکۆ دوای ئەوەی دڵنیابوو مریەم وەڵامی تەلەفوونەکەی ناداتەوە، هەستا و لە دەرگاکەیدا. بەڵام مریەم بێئەوەی چاو لەسەر وێنە ڕووتەکەی خۆی لابەرێت لە ئاوێنەکەدا، هیچ وەڵامی نەدایەوە. بەڵکوو لەو ساتەدا بیری لەوە دەکردەوە، زۆرجار مرۆڤ دواتر و درەنگ دەزانێت، خۆشەویستی ژیانی مرۆڤەکان وێران دەکات.

شێرکۆ چەند جارێکیتر لە دەرگای دایەوە، بێئەوەی هیچ وەڵامێک بدرێتەوە. ناچار لەبیەرخۆ وتی: باشە... بەڵام تەنها دەمەوێت ئەو کاغەزانەم بدەیتێ، کە لەسەر کۆمەدییەکە دامناون.

مریەم بە هەمان ئارامییەوە بەدەست قژی شانەدەکرد و هەرجارێک بەشێوەیەک ڕێکی دەخست و لێی ڕادەما، وتی: تکایە دەتوانیت کاتێکیتر بیانبەیت.

پاش کەمێک گوێی لە داخستنی دەرگای دەرەوە بوو. بێئەوەی بزانێت، کە ئیتر هەرگیز شێرکۆ نابینێتەوە.

دوای ئەوە مریەم بەهەمان هەستی سووکییەوە، کە لە بەیانی زووەوە بڕیاری جیابوونەوەکە پێیبەخشیبوو، بە ڕووتی لەسەر سیسەمەکە ڕاکشا و بیری لەوە دەکردەوە: بڵێی هەر لەسەرەتاوە، کاتێک لەگەڵ

شێرکۆ بڕیاری پێکەوە ژیانمدا، هەڵە نەبوویم؟ یا ئەمە پەیوەندی بە جیاوازیمانەوە هەیە وەک دوو جۆر مرۆڤ، کە هەریەکەمان شتێکی جیاواز لەویتردا دەبینێت و دەیەوێت. بەوەی ئافرەت دەیەوێت کاتێک پیاو دێتە ناوییەوە، بۆ ئەبەد بمێنێتەوە. ئەوانیش دەیانەوێت وەک باڵندە بن. بەڵام ئەوەی سەیربوو بەلای مریەمەوە، ئەوەبوو ڕقی لە شێرکۆ نەدەبووەوە، هەرچۆن زۆربەی چیرۆکی خۆشەویستییەکان دەگۆڕێن بۆ ڕق. بیری لە شەڕ و ئاشتبوونەوەکانی نێوانیان کردەوە، کە زیاتر لەسەر شتی بچووک بوون و پاش ماوەیەک لە بێدەنگ بوون، کاتێک شێرکۆی بانگ دەکرد یاخود کە دەچووە لایەوە، ئاسایی دەبوونەوە. مریەم نەیدەویست زۆر لەگەڵ شێرکۆدا بڵێت تا نەتۆرێت، چونکە دەیزانی شێرکۆ کەللەرەقییەکی تێدایە و دەتوانێت بە هەفتە ببێت بە بەرد لە ماڵەکەدا، شێرکۆ خۆی ئەمەی وەک سیفەتێکی خراپی خۆی بۆ مریەم باسکردبوو. چەند جارێکیش ئەمە ڕوویدابوو، هەربۆیە مریەم نەیدەهێشت شێرکۆ بگاتە ئەو ڕادەی بێدەنگ بوونە. تەنانەت لەکاتی سێکسیشدا ئەمە ڕوویدا بوو، کاتێک مریەم بێدەنگ پاڵکەوتبوو، بێئەوەی هیچ بکات. شێرکۆ پێی وتبوو بەم بێدەنگی و جوڵەنەکردنەت، هەستێ ئەوەم دەدەیتێ من لاقەت بکەم، یاخود فەرمانبەرێکی سێکس بم لەلات، نەوەک تەواوکەری یەکتربین. ئەمەش وایکردبوو ژوورەکە بەجێبهێڵێت و بڕوات لە هۆڵەکە بنوێت. بەڵام ئەوە کاتێک بوو، کە مریەم نەیدەزانی لەوکاتانەدا دەبێت چی بۆ شێرکۆ بکات و چ جۆرە قسەیەکی بۆ بکات. مریەم بیریشی لە ساتە جوان و خۆشەکانی نێوانیان دەکردەوە، بەتایبەت کاتێک پێکەوە دەنووستن، شێرکۆ دەیزانی چۆن یاری لەگەڵ لەشی ئەمدا بکات و دەشیزانی دەبێت چی بۆ بکات تا تەواو بیوروژێنێت. بەتایبەت بە زمانی، کە مریەم هەموو جارێک پێیدەوت ئەم زمانە سەگبابەت شێتم دەکات. مریەم

دوای ئەو بڕیارەش نەیدەتوانی ڕقی لە شێرکۆ بێت. بەخۆی وت: بڵێی بڕیارێکی پەلەم نەدابێت؟ وتنی ناوێک بەسە بۆ ئەوەی هەموو شتێک کۆتایی بێت؟

***

ماڵەکە تەواو کپ و بێدەنگ بوو، مریەم هەستی بە تینوێتی کرد، ویستی هەستێت تا بەرەو مەتبەخەکە بچێت، بەڵام هەستیکرد لەشی سووکێتییەکەی پێشتری نەماوە. وەک ئەوەی گومان و بیرکردنەوەکانی گەراندبێتیانەوە سەر زەوی. خۆی خستە سەر لا، تا هەوڵبدات هەستێت، لەوکاتەدا چاوی بەو لاپەڕانە کەوت کە لەسەر کۆمەدییەکە بوون و پێشتر شێرکۆ داوای کردبوون. کەمێک دوودڵ بوو، بەوەی پێشتر سەیری نووسین و شتە تایبەتەکانی شێرکۆی نەکردبوو، تەنانەت مۆبایل، یاخود ئەگەر شێرکۆ بیری بچوایە ئیمەیل یاخود فەیسبوکەکەی دابخاتەوە، ئەم هەوڵینەدەدا سەیریان بکات. چونکە دەیزانی سەیرکردنی شتە تایبەتەکان، مانای بوونی گومانێک دەدات و ئاماژەشە بۆ ئەوەی، کە نە شێرکۆ و نە ئەمیش، بە هەڵبژاردنی خۆیان لەگەڵ یەکتر ناژین. بەڵام ئەم بەیانییە خۆی درێژکرد و کاغەزەکانی سەر کۆمەدییەکەی بەرەو لای خۆی هێنا. جارێکیتر کەوتەوە سەرپشت و هەر بە ڕووتی، پاش ڕێککردنی پشتییەکەی ژێر سەری، دەستی بە خوێندنەوەی یەکەم بەشی دەستنووسەکەی شێرکۆ کرد، کە ڕۆمانێک بوو بەناوی (سوارەکانی تەنیایی)یەوە، وەک لە یەکەم لاپەڕەدا نووسرابوو.

***

# منیش دڵنیانیم
# ئەوەی دەژی، منم یاخود ناوەکەمە؟

ئێستا تۆ شوناسنامەکەت سەیربکە و لە ناوی خۆت ڕابمێنە: ئایا تۆ هەر ئەو کەسەیت، لەوێدا ناوەکەی نووسراوە؟ ئەی بۆ کەسێکیتر نیت؟ ئایا هەر ناوێك، کەسێکیترمان لێ دەخولقێنێت؟ ئەوەی لە ئێمەدا جێگیرە، خۆمانین یاخود ناوەکانمانە؟ یاخود هیچمان جێگیر نین و دەگۆڕێین؟ هەرچۆن لەژیاندا هەندێك سات هەیە، کاتێك پێدەخەینە ناوییەوە، ئیدی ئێمە مرۆڤەکەی پێشتر نین و ژیانمان ئاڕاستەیەکیتر وەردەگرێت. ئیدی ئێمە ئەو کەسە نابین، کە پێشتر بووین. هەرکەسێکیش دەتوانێت ئەو وێستگانە لەژیانیدا بدۆزێتەوە، کە تیایدا بەڕادەیەك گۆڕاوە، وەك ئەوە وایە بووبێتە کەسێکیتر. هەرچۆن ناوەکانیشمان دەگۆڕدرێن. من بۆخۆم کاتێك بیر لەو ڕێکەوتانە دەکەمەوە لە ژیانمدا ڕوویانداوە و بە قوڵیی لە گەوهەرەوە منیان گۆڕیوە، ئەو کەسایەتییانە دەبینمەوە، کە لەم ژیانە کورتەمدا هەمبوون، ئەگەرچی هەموویان هەر لەژێر یەك ناودا ژیاون و یەك ناویان هەڵگرتووە. کاتێك تۆ گەنجێکی شەرمن بوویت و هاتوچۆی مزگەوتت دەکرد و لە نوێژەکانتدا کز دەوەستایت، وەك ئەوەی خوا بەتایبەت چاوی لێت بڕیبێت... ئایا هەر ئەو کەسەیت، دواتر بۆ خوێندن چوویتە بەغدا و شەو هەبوو بە سەرخۆشی

بە شەقامە چۆڵەکانیدا دەسوڕایتەوە و ڕووە و تاریکییەکە جنێوت دەدا؟ پاشان ئەوکاتەی لەنزیک کەنارەکانی دەریای ئیجە، بەلەمەکەتان لەبەر قورسی و کۆنی، خۆی لەبەردەم شەپۆلی دەریادا نەگرت و قلپ بووەوە، تۆ هەر ئەو کەسەی پێشوو بوویت، کاتێك دڵڕەقانە دەبەیەکی بەتاڵت لەدەست منداڵێك ڕفاند و دەتویست لەو دەریا شێتەدا ژیانی خۆتی پێ ڕزگار بکەیت؟ چاویشت لە منداڵەکە بوو بەدەم هاوارەوە بۆ هەتا هەتا نوقم دەبێت و دەریا هەڵیدەلووشێت؟ ئایا تۆ لە هەموو ئەو ساتانەدا هەر خۆت بوویت و هەر کەسەکەی پێشترت بوویت؟ یاخود هەرجارە و دەگۆڕایت بۆ کەسێکیتر و ژیانی کەسێکیتر لە تۆدا دەستی پێدەکرد؟ کەسێك جیاوازتر لەوەی پێشووت. ئایا تۆ دەتوانیت بەدرێژایی تەمەنت یەك وەڵامت هەبێت بۆ پرسیاری: من کێم؟ ئەوکاتەی موسوڵمانێکی ئیماندار، یاخود چەپ و بێباوەڕ بوویت، تۆ هەر یەك کەس بوویت؟ ئەوکاتەی لە ڕیزی شۆڕش بەناوی ئازادییەوە دەجەنگایت، هەر ئەو کەسە بوویت دوای شۆڕش بووە بازرگانی نەوت؟ یاخود چەندان کەسایەتی جیاوازیت و لە پشت ناوێکەوە خۆت حەشارداوە؟ وەك ئەوەی ناوەکان ئامرازێك بن بۆ خۆحەشاردان و ناو ڕواڵەت بێت و مرۆڤیش گەوهەر بێت. ئەی ئەو کچەی بەناوی شەرەفەوە لە ڕێگایەکی چۆڵ دەکوژرێت و لاشەکەی فڕێدەدرێت، هەر ئەو کچۆڵەیەیە کە ڕۆژانێك بە خەونێکی زۆرەوە لە ئایندە و گەورەبوون و ژیانی دەڕوانی؟ ئەوەی گۆڕا، کچەکە بوو یاخود ناوەکەی وەك سۆزانی؟ یاخود هەردووکییان؟ ئەوەی لە ئێمەدا دەگۆڕدرێت خۆمانین یاخود ناوەکانمانە؟ وەك ئەوەی ئێمە لەو پاڵەوانانە نەچین، کە لە سەرەتا تا کۆتایی فیلمەکان، بەدکار و خراپەکار، یاخود عاشقن. بەڵکوو ئێمە لە ژیانماندا چەندین کەسایەتی جیاواز دەژین. هەرچۆن دەشێ چەندینجار بەناوی جیاوازەوە بژین.

ئێستا واز لە ناوی خۆت بهێنە و ئەو کتێبە بچووکە بەدەستەوە بگرە،

کە لەزۆربەی ماڵەکاندا هەیە و ناوی (ناوی کوردی بۆ منداڵان)ە و چاو بە پەڕەکانیدا بخشێنە. لەناو ئەو ناوە زۆرەی بۆ کوڕان و کچان نووسراون، با ناوی (ئازاد) بە نموونە وەربگرین و ئەندێشەی ئەوە بکەین، چەند کەس لەژێر ئەو ناوەدا پۆلێن دەکرێت؟ یەك کەس، یاخود بیست، سەدان و هەزاران کەس؟ من بۆ خۆم نازانم و دڵنیانیم لەو ژمارەیە، چونکە دەشێ لە ئێران، پاکستان، ئەفغانستان و هیندستانیش زۆر کەس هەبێت ئەو ناوەی هەڵگرتبێت. بەڵام ئەوەی دڵنییام لێی، ئەوەیە من چەند کەسێك بەو ناوەوە دەناسم، (هەرچۆن دەشێت تۆش چەند ئازاد ناوێك بناسیت)، وەك: ئازاد شەوقی، ئازاد سوبحی و...

من هێشتا چاوم لەسەر ناوی ئازادە لەناو لیستی ناوەکاندا و لەخۆم دەپرسم: ئازاد سوبحی کێیە، چۆنە و چییە؟ بڵێی پێناسەی من بۆ ئەو، پەیوەندی بە ناسینی منەوە نەبێت بۆی؟ ئەگینا لە وردەواڵەفرۆشێکی سەر شەقامێکی شاری (فری تاون)ی سیرالیون، کە لە ژێر کەپرێکی بچووکی لە گەڵا دروستکراو دانیشتووە، یاخود لە نانەوایەکی بەرشەلۆنە، کە تا مەچەکی لە هەویردایە و لە ژێرزەمینی بینایەکی کۆندا سەرقاڵی کارە، لەبارەی ئازاد سوبحییەوە بپرسیت، ئەوا تەنها شانێك هەڵدەتەکێنن و ڕوو وەردەگێڕن تا خەریکی کاری خۆیان بن، یاخود بەسەرسامییەوە لێتدەڕوانن وەك ئەوەی لە پرسیارەکەت تێنەگەیشتبن. بڵێی تەنها وەسفکردنی شێوەی ئەو کەسەی دەیناسین، بەس بێت بۆ جیاکردنەوەی لە ملیۆنان کەسی دیکە، کە دەشێت هەمان وەسف بیانگرێتەوە؟ یاخود دەبێ باسی شیعر و تابلۆ و تایبەتمەندییەکانیتری ئەو کەسانە بکەین، کە لەوانیتریان جیادەکاتەوە؟ خۆ ئەگەر بمانەوێت زیاتر لەگەڵ یاریی ناوەکاندا بڕۆین، ئەوا با گریمانەی ئەوە بکەین، ئازاد سوبحی ناوێکی خوازراوبێت و لە ڕاستیدا ئەو کەسەی من دەیناسم، ناوێکیتری هەبێت؟ لەم دۆخەدا ئایا ئەو

کەسە کێیە، من بەناوی ئازاد سوبحییەوە دەیناسم و وێنەیەکی لە یادەوەریی مندا هەیە؟ ئایا ئەوەی لە مندا دەژی، ناوەکەیە یاخود کەسەکە خۆیەتی؟ ئایا ئەوەی لە خەیاڵ و بیرەوەریی مندا دەژی، کەسەکەیە یاخود ناوەکەیەتی؟

من بۆخۆم تا ئێستا ڕێکەوتی چەند کەسێکم کردووە، تا ناوی سیانییان وەك ناوی من وایە و یەکێکیان لە چلەکانی سەدەی بیستدا ژیاوە و من لەو وێنە ڕەش و سپییە کۆنانەدا بینیومە، کە ڕەفیقی وێنەگر لەسەرەتای شەقامی پیرەمێرد، بە جامخانەی دووکانەکەیدا هەڵیدەواسین. یەکێکیتریشیان ناوەکەیم لە گۆڤارێکدا بەناوی (ئەدەبی بێگانە)ەوە بینیوە، کە دەوروبەری ساڵی ١٩٨٢، چیرۆکێکی ئەمریکای لاتینی وەرگێڕاوە بۆ کوردی. ئەگەرچی دەشێ کەسێك ئێمەی لێتێکەڵ بێت، بەڵام من دڵنییام ئەو کەسانە، هیچیان من نین.

لە کتێبی ناوەکاندا، کۆمەڵێك ناوی زۆر هەیە بەپێی ئەلف و بێی کوردی ڕیزکراون، بەڵام لەوێدا تەنها ناوەکان بوونیان هەیە و هیچ مرۆڤێك ئامادە نییە و دەشێ ناوی تێدا بێت، هیچ کەسێك خۆی لە پشتییەوە نەشاریتەوە، یاخود ڕۆژێك کەسی پێوە بانگ نەکرێت، بەڵام نازانم بۆ کاتێك لە ناوەکان ورد دەبمەوە و دەیانخوێنمەوە، وێنای کەسانێکییان بۆ دەکەم، سیما و ژیانییان ئەندێشە دەکەم و زۆر ڕووداوی ژیانیان دێت بەخەیاڵمدا. وەك ئەوەی بەڕاستی هەبن، یاخود هەبووبن. چونکە ناوەکانیش دەتوانن وەك ئێمە بژین و بەدرێژایی مێژووش، ناو زۆر هەبوون، کە ژیاون و لەوانەیە ئێمە بیانناسین، بێئەوەی لە ڕاستیدا کەسێك بووبن. لەدنیای نووسیندا نموونەی ئەمە زۆرە و زۆرجار نووسەرێك لەبەر هەر هۆکارێك بووبێت، بەناوی کەسانی وەهمییەوە نووسیویەتی. دیارە ئەمەش جیاوازە لەوەی بە ناوی خوازراو ناودەبرێت و زۆر کەس پەنای بۆ دەبات. بۆ نموونە ئێمە دەزانین (نالی) ناوێکە (مەلا خدر)

خواستوویەتی تا شیعری بەناوەوە بنووسێت، بەڵام (مەهدی حەیدەر) کێیە، کە ڕۆمانی (جیهانی سەددام حسەین)ی بەناوەوە نووسراوە و لە کۆتایی ٢٠٠٢دا (بڵاوکراوەکانی الجمل) چاپی کردووە و کەس نایناسێت و نازانرێت لە ڕاستیدا ئەو کەسە کێیە، لەپشت ئەو ناوەوە ئەو ڕۆمانەی نووسیوە؟ بەڵام تا ئێستاش کە قسە لەو ڕۆمانە بکرێت، هەر باسی مەهدی حەیدەر دەکرێت وەك نووسەرەکەی. بڵێی بەڕاست مەهدی حەیدەری وەهمی و نەبوو، ئەو ڕۆمانەی نەنووسیبێت؟ هەرچۆن هەندێکجار لێکۆڵەرەوەیەك هەڵدەستێت بە ساغکردنەوەی شیعرێکی نالی، لەبەرئەوەی گومان دەکات نالی نەینووسی بێت، تا سەرئەنجام بۆی دەردەکەوێت ئەو شیعرە نالی نەینووسیوە. ئایا دەبێت ئەو شیعرانەی مەلا خدر بەناوی نالییەوە نووسیونی، لەوانە جیابکەینەوە کە نالی نووسیونی (کە زۆر کەس پێیوایە بە ناوی نالییەوە نووسراون).

سەلاحەدینی ئەیوبی (١١٣٨ - ١١٩٣) ٥٥ساڵ ژیاوە، بەڵام ناوەکەی، تا ئێستا نزیکەی ٨٢٠ ساڵە دەژی. هەربۆیە ئێستا دەتوانم ئەو نهێنییە بڵێم کە ئەوەی دەژی، ناوەکانە نەوەك کەسەکان. ئەو کەسەی لە ساڵی ٣٩٩ی پێش زاینییدا ژەهرەکەی خواردەوە، بۆ هەتا هەتایە مرد، بەڵام تا ئێستا سوکرات لەگەڵماندا دەژی. هەرچۆن مەلا خدر لە ئەستەنبول گۆڕغەریب دەبێت، بەڵام نالی هەر لەژیاندا ماوە و دەشێ لە کۆڵانێکی ئەستەنبول چایچی بێت، یاخود لە ویستگەی شەمەندەفەرێکی شارۆچکەیەکی دووری ئەنادۆڵ فەرمانبەر بێت و بەدەم ڕێبوارانەوە پێبکەنێت. خۆ دەشێت ڕۆژێك لە فەرمانگەیەکدا ڕێکەوتی دەستوورەت کردبێت، بەپێکەنینەوە کارەکەتی ڕایی کردبێت و تۆ نەتناسیبێتەوە. لەوانەشە ڕۆژێك لە قاوەخانەیەکی بچووکی پاریسدا، کوپێك قاوەی بۆ دانابێت و بە بزەیەکەوە، دوای ئەوەی سەیری ئەو [illegible] کوردییەی کردووە کە دەیخوێنیتەوە، پرسیبێتی تۆ کوردیت؟

بەڵام تۆ نەتزانیبێت ئەو خانمە کرێکارە، مەستوورەیە.

مێژوو تەنها سەرزەمینی مرۆڤە ڕاستەقینەکان نییە، بەڵکوو ناوەکانیش وەک ئێمە ژیانی تێدا دەکەن. لەگەڵ ئێمەدا ئەنکیدۆ، یولیسیس، سیدهارتا و هەزاران ناوی‌تر دەژین، کە دەشێ ڕۆژێک کەسێکی ڕاستەقینە نەبووبن و تەنها ناو بووبن. ئەمەش ڕووداوێکم بەیاد دەهێنێتەوە، کە لە زۆر شوێن و کاتی جیاوازدا ڕوویداوە و من ئەوەیان دەگێڕمەوە، کە پەیوەندیی بە فەرمانڕەوایی بەعسییەکانی عێراقەوە هەیە. لەدوای ڕووخانی دەسەڵاتی سەددام حوسەین لە ساڵی ٢٠٠٣ و لەناو بەڵگەنامە و نووسراوە نهێنییە زۆرەکاندا، چیرۆکێکی سەیر و سەمەرەی یەکێک لە کارمەندی دەزگا نهێنییەکانی ئەو ڕژێمە ئاشکرا بوو، کە بەرپرسی تۆڕێکی سیخوڕی دەبێت لە کوردستاندا و لەناو ئەو کەسانەی سەرپەرشتییان دەکات، چەند ناوێکی وەهمی هەیە، کە خۆی دروستی کردوون و ڕاپۆرت بەناویانەوە دەنووسێت و کار و چالاکییان بۆ دروست دەکات، تا لەو ڕێگایەوە بتوانێت تۆڕەکەی چالاک نیشان بدات و متمانەی زیاتری پێبکەن. ئاشکرابوونی چیرۆکی ئەو کارمەندەش لەبەر دروستکردنی کەسانی وەهمی، لە ڕێگای ئەو فەرمانی لە سێدارەدانەیەوە دەزانرێت، کە لە دژی دەرکراوە و لە دۆسییەکەیدا هەڵگیراوە. هەمیشە دەسەڵاتەکان زیاتر لەناوی خوازراو و کەسانی وەهمی دەترسن، وەک لە کەسە ڕاستەقینەکان. هەربۆیە یەکەم کار لە شۆڕشەکاندا دەکرێت، گۆڕینی ناوی شۆڕشگێڕەکانە و کردنیانە بە کەسانی وەهمی و نەناسراو.

بەڵام ئەوە ترسناک نییە، لەگەڵ ئێمەدا چەندین ناوی وەهمی و ئەندێشەکراو بژین و بتوانن وەک ئێمە مووچە وەربگرن، بەشداری هەڵبژاردن بکەن، وتار و کتێب بنووسن و کۆمپانیا و خانوویان بەناوەوە هەبێت، بەڵکوو ترسناک ئەوەیە مرۆڤ لەساتێکدا بۆی دەربکەوێت، ئەم خۆی هیچ نییە، جگە لە ناوێکی وەهمی، کە وا

مریەم هەستا و بە تەنها ڕۆبێکی نیلیی تەنکی لەبەرکرد، کە نەخشی ئەژدیهایەکی چینی لە پشتیدا بوو، بەرەو مەتبەخەکە ڕۆیشت و بیری لە یاریکردنی مەمکی نەدەکردەوە، کە جارجار لە درزی ڕۆبەکەوە یەکێکیان دەهاتە دەرەوە. دوای ئەوەی قاوەیەکی دەمکرد، درزێکی خستە پەنجەرەکە و جگەرەیەکی داگیرساند. ئەو پێشتر ڕانەهاتبوو لە ژوورەوە جگەرە بکێشێت، بەڵام وەک ئەوەی لەبەیانییەوە بووبێتە کەسێکیتر، شتەکان گۆڕابوون. ئەگەرچی دەیویست خۆی لابدات لەوەی جارێکیتر بیر لەوە بکاتەوە، ئێستا ئەم ماریایە یاخود مریەمە.

ژنێکی لە پەنجەرەکەوە بینی، بەدیار سەگەکەیەوە وەستابوو، کە لەبن دارێکدا میزی دەکرد. بەخۆی وت بڵێی ژیان لەگەڵ سەگێکدا ئاسودەتر نەبێت؟ بەڵام هەرزوو ئەو بیرۆکەیەی لە مێشکی خۆی دەرکرد و هەستی کرد بیرکردنەوەش لێی، ناشرینە. چونکە ئەگەرچی ئەو هەموو ساتە خۆشانەی لەگەڵ شێرکۆدا هەیبوون، دەبنە بیرەوەری، بەڵام جوانیی خۆیان هەیە و بەشێکن لەخۆی. بەتایبەت شێرکۆ، کە دەیزانی چۆن یاری لەگەڵ لەشیدا بکات. ئاخر ئەمە گرفتێکی گەورەی بوو لەگەڵ (ئاکام)دا.

ساڵانێکی زۆر تێپەڕیوە بەسەر ناسینی ئاکامدا و زۆرجار خۆی لاداوە لە بیرکردنەوە لێی. چونکە ترسناکترین وێنە ئەوەیە مرۆڤ لەبەردەم خۆیدا، خۆی ناشرین ببینێت. ئەوکاتەی شووی بە ئاکام کرد، کچێکی گەنج بوو، وەک زۆر کەسیتر لەساڵانی شەڕی ناوخۆ و گرانییەکەی نەوەدەکاندا، خەونی بەوەوە دەبینی کوردستان جێبهێڵێت و بەرەو خۆرئاوا هەڵبێت. بەڵام نەیدەتوانی وەک کوڕانی خزم و ناسیاو جانتایەک هەڵبگرێت و دوای قاچاخچییەک بکەوێت و دۆڵ و چیا و دەریاکان ببڕێت. هەربۆیە ئاکام ئەو فرسەتی هەڵهاتنەی هەبوو، ئەگەرچی دوای سێ ساڵ کاتێک لێی جیابووەوە، پاساوی ئەوەی

دەمێنایەوە، ئاکام لەناو جێگادا جگە لە پەیکەرێک، هیچیتر نییە و هیچی پێناکرێت. بەلام بۆ خۆی دەیزانی درۆ دەکات، هەربۆیە تا ئێستاش خۆی لە بیرکردنەوە لەو ڕووداوە دەدزێتەوە. کاتێک ئاکامی لە سەفەرێکی بۆ کوردستان ناسی، وەک کوڕە مەغریبییەکە چۆن شەرێک ئەمی تووشی وەهمی خۆشەویستی کرد، ئەمیش پێشتر ئەو بارییەی لەگەڵ ئاکامدا کردبوو، چونکە نەیدەویست لە کیسی بچێت.

دوای چەند ساڵێک تەنیایی، لە شارێکی ساردی وەک ستۆکهۆڵمدا، پیاسەی شەو درەنگان، بەدەم بەرزکردنەوەی پێکی شەرابەوە لە بارێکدا و قاقالێدان لەگەڵ هاوڕێیانیدا، سەفەرکردن بۆ وڵاتانی دوور و نامۆی زۆر کەس، هەستی کرد ئەم ژیانەشیان درۆیەکیترە و لەگەڵ خۆیدا دەیکات. چونکە دەیزانی ئەو ژیانی تەنیاییە ماندووی دەکات، کە وەک کۆچەرییەک خۆی دەبینی. هەربۆیە کاتێک شێرکۆی ناسی، جیاواز لە پیاوەکانیتر، نەیدەویست تەنها بۆ جارێک یاخود چەند جارێک دلوەتی سەر جێگای بکات. بەڵکوو دەیویست بمێنێتەوە و بەیانییان کەسێک هەبێت لەگەڵیدا نان بخوات، بتوانێت لەگەڵیدا بیر لە ساڵێک و دوویتر بکاتەوە. پلانی سەفەر دابنێن و لە کڕینی شتی ماڵەکەدا ڕای خۆی بدات. هیچ نەبێت کەسێک هەبێت قسەی بۆ بکەیت و شەڕی لەگەڵ بکەیت. ئەوکاتە حەزێکی زۆری هەبوو بۆ جێگیربوون. کاتێکیش زانی شێرکۆ منداڵی نابێت، وا خۆی نیشاندا هیچ بۆی گرنگ نییە. بەڕاستیش بۆی گرنگ نەبوو، چونکە شێرکۆی خۆشدەویست و هێمنییەکەی بەلاوە جوان بوو. هەربۆیە ئێستا کە بیر لە شێرکۆ دەکاتەوە، دەزانێت زۆرجار وەک منداڵێکی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووە و نازی دلوەتی. ئیدی هەرزوو شێرکۆ ماڵی گواستەوە بۆ ماڵەکەی ئەم، کە تەنها کتێبخانەیەکی بچووک و دوو جانتای لەگەڵ خۆیدا هێنا. چونکە وا ڕێککەوتن، شتەکانیتری نەهێنێت، لەبەرئەوەی

پێویستیان نییە. ئێستا نزیکەی حەوت ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژەدا تێپەڕیوە. لەو ماوەیەشدا زۆر شت گۆڕاوە. مریەم لە خۆی پرسی: بەڕاست بەدرێژایی ئەم ساڵانە، شێرکۆم خۆشویستووە؟ ئەم گومانە ئازاریدا، بەوەی دەترسا ئەم چەند ساڵە، بێئەوەی بەخۆی زانیبێت، جارێکیتر لە وەهمی خۆشەویستیدا ژیابێت و درەنگ پێیزانی بێت.

ئەو ڕۆژە کەمێک لەبەردەم تەلەفیزیۆن دانیشت و سەیری دیمەنی ڕمانی دوو تاوەرەکەی نیۆرکی کرد، کە زۆربەی کەناڵەکان سەرقاڵی یادکردنەوەی ئەو ڕووداوە بوون و جار لەدوای جار دیمەنی خۆپیاکێشان و ڕمانی دوو تاوەرەکەیان لێدەدایەوە. دڵنیابوو ئەو هەستەی بەیانی نەماوە و لەجێگای ئەوە، هەستی بە لەشگرانی کرد. بەتایبەت کاتێک لەگەڵ ڕمانی دوو تاوەرەکەدا، کتوپڕ ئەو ڕۆژەی هاتەوە یاد، لەوکاتەی فڕۆکەکان خۆیان دەکێشن بە دوو تاوەرەکەدا، ئەم لە ژووری ئوتێلێکی بچووکی بەرشەلۆنە لەگەڵ کوڕێکی مەغریبیدا نووستبوو، کە ئێستا چەندی کرد ناوەکەی بیرنەکەوتەوە. چونکە بەڕاستی هەوڵیدابوو فەرامۆشی بکات. ئەو کوڕە زۆر لێزانانە لە کافیتریایەکدا لێینزیک بوەوە. بەڵام هەردوای ئەو شەوە زانی ئەو کوڕە یەکێکە لەوانەی لە باڕ و کافیتریاکاندا بەدوای ئەو ئافرەتانەدا دەگەڕێن، کە لە تەنیاییدا سەفەر دەکەن و ئەمانیش دەتوانن لە ڕێگای نیشاندانی خۆشەویستی و سەرسامبوون پێیان، چەند شەوێکیان لەگەڵدا بەسەربەرن. پێشتر بەسەرهاتی وای بیستبوو. بەڵام زیاد لە ڕێگایەک هەیە بۆ فریودانی مرۆڤ، هەمیشە خۆشەویستی ئاسانترینیانە. ئەم یادگارییە ناخۆشە، ئەو گومانەی خۆی بیر بردەوە، کە کەمێک پێشتر سەبارەت بە وەهمی خۆشەویستی لای دروست ببوو. بەوەی مرۆڤ لە خۆشەویستیدا داخوازییەکانی زیاتر و زیاتر دەبێت. بەڵام کوڕە مەغریبییەکە، وای لێکرد شەوێک لە وەهمی خۆشەویستیدا بژی و دەبوو ئەم زۆر وەک

نێچیرێک لێی هەڵبێت.

ئەو ڕۆژە هیچ بیری لەو بەشە نەکردەوە، کە لە دەستنووسەکەی شێرکۆی خوێندبووەوە. ئەگەرچی لەکاتی خوێندنەوەیدا، باسکردنی لە (ناو) بەوشێوەیە، بە لایەوە سەرنجڕاکێش بوو.

***

# ئێوارەی ١٢ی سێپتەمبەر

مریەم دوای پیاسەیەکی زۆری بێ مەبەست لە سەنتەری شار و سەردانیکردنی چەند دووکانێکی گەورەی پێڵاو و پۆشاک فرۆشتن، پاشان دانیشتن لە قاوەخانەیەکی شەقامی (درۆتنین گاتان) بە تەنیا، درەنگانێک گەڕایەوە ماڵەوە و ئارەزووی لە نانخواردن نەبوو. هەرچۆن نەیویست ماڵەکەش ڕۆشن بکات و تەنها چەند مۆمێکی داگیرساند. پێدەچوو بەدرێژایی ئەو ڕۆژە چاوەڕوانی شتێک بووبێت، ئەویش تەلەفوونی شێرکۆ بێت. ئەو بێدەنگییەی شێرکۆی بەلاوە سەیربوو.

دەمەو عەسر تا کەمێک بێزاری خۆی کەم بکاتەوە، زەنگی بۆ ڕووناکی هاوڕێی لێدا و کەمێک قسەی لەگەڵکرد. هەر ئەوکاتە وا ڕێکەوتن سبەینێ عەسر بچێت بۆ ماڵی ڕووناک لە گەڕەکی ئەکالا، چونکە چەند هاوڕێیەکیتریشیانی دەعوەتکردووە. کاتێک مریەم پرسیاری ئەوانیتری لێکرد، ڕووناک بەدەم پێکەنینە درێژەکەیەوە وتی پێت ناڵێم با بەیانی خۆت بیانبینیت. کاتێک چوو لە ژووری نووستنەکە خۆی بگۆڕێت، چاوی کەوتە سەر دەستنووسەکەی شێرکۆ و بیری کەوتەوە، کە لە دوێنێوە نەوەک هیچی لێنەخوێندۆتەوە، بەڵکوو نەشیپەرژاوەتە سەر ئەوەی بیریشی لێبکاتەوە. دوای خۆگۆڕین، دەستنووسەکەی هەڵگرت و بەرەو مەتبەخەکە گەڕایەوە.

لەم تەنیاییە کوشندەیەدا، وەک ئەوەی گەڕابێتەوە ساڵانێک لەمەوبەر

پێش ئەوەی شێرکۆ بناسێت، دەیویست بیر لە هیچ نەکاتەوە. مریەم یەکەمجاری نەبوو بۆنی تەنیایی بێزاری بکات. ئەو زۆرجار لەکاتی قسەکردن لەگەڵ هاوڕێ ژنەکانیدا وتبووی من تەنیایی خۆی نا، بەڵکو بۆنەکەی دەمکوژێت و وەڕسم دەکات. ڕقم لە بۆنی ئەوماڵەیە، کە بەتەنیا تیای دەژیم. هاوڕێکانی بەم قسەیەی پێدەکەنین. تەنانەت زۆرجار ویستبووی بە چوونە دەرەوەی شەوان و ناسینی پیاوانیتر، ئەم بۆنی تەنیاییە بکوژێت. بەڵام بەلایەوە ئەوە ترسناک بوو، پیاوەکان تەنیاترت بکەن. ئەو دەیزانی ئافرەت بوونەوەرێکی تەنیانشینە و کاتێک خوڵقێنرا، بۆ ئەوە بوو تا تەنیایی ئادەم بکوژێت. هەربۆیە هەرگیز ستایشی تەنیایی نەکردووە و نەیتوانیوە وەک دایکی، لەگەڵ تەنیاییدا هەڵبکات. بیریەتی دوای مردنی باوکی، دایکی بەدرێژایی ساڵانێکی زۆر، بە تەنیا لە گۆشەیەکی حەوشە دادەنیشت و زۆرجار دەگریا، بێئەوەی کەس گوێ بە گریانی ئافرەتێکی تەنیا بدات و لە پەراسووەکانی، پیاوێکی بۆ بخوڵقێنرێت، تا تەنیاییەکەی بکوژێت.

لە نزیک پەنجەرەکە دانیشت و دەستی بە خوێندنەوەی بەشێکیتری دەستنووسەکە کرد.

***

لە دووەمین جەنگی جیهانیدا، وڵاتی سوید بەشداریی ئەو شەڕە کاولکارەی نەکرد، ئەورووپا لەناو غوباری شاری ڕووخاو، سەرما، برسێتی، سەربازگەکانی ڕاگواستن، کوژراو و بریندارەکانیدا دەگەوزا. ئەویش بەوەی توانرا سوید وەك وڵاتێکی بێلایەن بهێڵرێتەوە و لایەنگری هیچ بەرەیەکی شەڕەکە نەکات و لەو چارەنووسە تاڵە بپارێزرێت، کە ڕووبەڕووی وڵات و شارەکان ببووەوە و یەك بەدوای یەك لەژێر بۆمب و زنجیری تانکدا وێران و خاپوور دەبوون. هەرچەندە کەسانێك هەن ئەم هەڵوێستەی دەسەڵاتدارانی سوید، لە ڕوویەکی ئەخلاقییەوە سەیردەکەن و پێیانوایە بەجۆرێك یارمەتیدەری درێژبوونەوەی تەمەنی نازییەکان و جەنگەکە بووە.

لەبەرانبەر بێلایەنیی سویدییەکان، ئەڵمانەکان کە خەونیان دەستبەسەراگرتنی جیهان بوو لەڕێگای ئەو سوپا دڕندە و دڵڕەقەیانەوە، کە وا دەردەکەوتن لە یەکێك لە داستانە کۆنەکانی گریکەوە هاتبێتنە دەرەوە و هەر سەربازێکیان دوای مردنی زیندووببێتەوە، مەرجییان لەسەر سویدییەکان ئەوەبوو: تا پیشەسازییە جەنگی و سەربازییەکەیان بەردەوام بێت و بتوانن چەك و تەقەمەنیی پێویست بۆ سوپاکەیان دابین بکەن، دەبێت سویدییەکان کەرەستەی خاو لە ئاسن و دار و... دابین بکەن و ڕێگا بە تێپەڕبوونی سوپا و کەلوپەلی جەنگییش بدەن لەوێوە بەرەو وڵاتی نەرویژ بڕوات، کە کەوتبووە ژێر دەستی نازییەکانەوە.

بەڵام مرۆڤ ئەو بوونەوەرەیە لەسەر خەون دەژی، ئەگەرچی مەرج نییە خەونی هەر کۆیلەیەك ئازادی بێت، بەڵام لەپاڵ ئەو کۆیلانەی تەسلیم بە قەدەری خۆیان ببوون و لەژێر قامچی و کاری قورسدا دادەڕزان، هەبووە خەونی ئازادی وەك پشکۆیەك لەدڵیدا گەشاوەتەوە، ئەگەرچی ئەو خەونە گەیاندبێتییە ئەشکەنجە و خاچ. ئەو درەوشەیەش هێزی ژیانە. ئێمەی مرۆڤ خەونمان هەیە و دەزانین هەموو خەونێکیش قوربانیی خۆی دەوێت. هەربۆیە لەژێر سایەی ئەو ڕێکەوتنەدا، لە سوید

ململانێ و بەرهەڵستیی نازییەکان و کۆمەکی ئەو جولەکانەش دەکرێت، کە لەترسی کوورەکانی سوتاندن هەڵهاتوون، یاخود دەربازیان بووە. هەروەك چۆن لە ناوچە و شوێنەکانی تر یارمەتی یاخی و تێکۆشەرانی دژ بە نازییش دەدرێت. ئەمەش وا دەکات جموجۆڵێکی زۆری سیخور، هەواڵگر و بکوژانێکی زۆر لەو وڵاتەدا هەبن، کە وەك زۆر شتیتری ژیان، لە لۆچەکانی مێژوودا خۆیان و ناوەکانیان ون دەبن و شوێن پێیان لەسەر بەفری ئەو وڵاتە جێ نامێنێت. پاشان هەر لەو ماوەیەدا چەندین مردنی تەمومژاویش ڕوودەدەن و نهێنییەکانیان ئاشکرا نابن.

لەو ساڵە سەخت و دژوارانەی جەنگەکەدا، کە مردن باڵی بە سەرزەمینی ئەوروپادا کێشابوو، لە سەربازگەکانی مردن و کاری قورس، لە سەرما و برسێتیدا گیانی جەنگاوەران و مرۆڤە شەکەت و برسییەکانی دەچنییەوە، نازییەکان چەند بنکە و نووسینگەیەکی نهێنی لە سوید دادەمەزرێنن، تا لە ڕێگایەوە کاروباری ناردنی کەرەستەی خاو، کاری سیخووری و هەواڵگری ڕێکبخەن و بشتوانن زۆر بەڵگە و شتی بەنرخ بگەیەننە ئەوێ و حەشاریان بدەن، تا نەبن بەژێر دار و پەردووی ئەوروپاوە و بفەوتێن. بەڵام لەگەڵ ڕووخانی دەسەڵاتی نازییەکان لە ئەڵمانیا، ئەم بنکانەش تیادەچن و دەفەوتێن، یاخود دەستدەگیرێت بەسەر نووسراو و بەڵگەنامەکانیاندا و بە تێپەڕینی ڕۆژگار فەرامۆش دەکرێن، یاخود وەك ئەرشیف لە ژووری تایبەتدا هەڵدەگیرسێن و دەرگایان لەسەر دادەخرێت، کە لەوانەیە چەند ساڵ جارێك، کەسێك بۆ کاری لێکۆڵینەوە ڕێگای نەکەوێتە لایان و پەڕەیەکییان هەڵبداتەوە. بەڵام لەناو ئەو دەزگا و نووسینگە نهێنییانەدا، یەکێکیان تەواو فەرامۆش دەکرێت و هیچی لەبارەوە نازانرێت، وەك ئەوەی هەر بوونی نەبووبێت. بەوەی لە پەنهانییەکی تەواودا بووە و لە سەروبەندی کەوتنی نازییەکانیشدا هەموو ڕێکخەر و سەرپەرشتیارانی ئەو دەزگا نهێنییە، لەماوەیەکی نزیك

بەیەکدا تیادەچن و ئەمەش وا دەکات ئەو دەزگایە، بەخۆی و کارە سەیر و نهێنییەکانییەوە، بەتەواوەتی ون ببێت.

***

ئەو دەزگا نهێنییەی نازییەکان لە شاری ستۆکهۆلم و لە ژێرزەمینی یەکێك لەو ئەپارتمانانەی ناوەندی شاردا دروستیدەکەن، کە لە کۆندا جێگای هەڵگرتنی بەرمیلە شەراب بوون، کاری چاودێری کردنی جۆرێك لە نووسەر بووە، کە خولیایەکی سەیریان بۆ نووسین هەبووە و هەستاون بەنووسینی چیرۆك و ڕۆمان، بێئەوەی ناوی خۆیانیان خستبێتە سەر، یاخود ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك پێویستی کردبێت، ئەوا لەژێر ناوی خوازراو و وەهمیدا نووسیویانن و ڕۆژێك بەدزییەوە لەسەر ڕەفەی کتێبفرۆشییەك یاخود لەناو کتێبی پۆلێنکراوی کتێبخانەیەکدا جێیانهێشتوون تا بەوشێوەیە و لەو ڕێگایەوە بگاتە دەستی خوێنەر.

ئەم خولیا سەیرەی ئەو نووسەرانە هەیانبووە، بەوپێیەی مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە و ڕەگی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر کۆنتر لە سەدەی بیست و دەرکەوتنی ڕژێمە هاوشێوەکانی نازییەکان، تەنها بۆ دەربازبوون نەبووە لە چاودێریی وردی ڕژێمەکان بەسەر خەیاڵیانەوە، یاخود تەنها بۆ دژایەتیکردنی دەسەڵات و دەزگا سەرکوتکەرەکان نەبووە، وەك وا بەدەردەکەوێت و وا هەستدەکەین ئەوە ڕێگایەکی خۆشاردنەوە بووبێت. بەڵکوو لەپشت ئەم خولیایەوە بڕوا و عەشقێکی سەیر بۆ خودی نووسین وەستاوە، وەك دواتر بۆم دەردەکەوێت و ئەگەر دەرفەتم هەبوو، کاتێکیتر بەوردی لەبارەیانەوە دەدوێم و هەوڵدەدەم لە نموونەی دیاری ئەم نووسەرانە بدوێم، کە کتێب وەك کلیلی جیهان دەبینن.

کاتێـك بەڕێکـەوت ڕازی ئـەو جـۆرە نووسـەرە و کاری چاودێریکردنـی وردی ئـەو دەزگا نهێنییـەی نازییەکانـم بـۆ ئاشـکرابوو، بـەوەی چـۆن کووچـە و کـۆلان، چاپخانـە، کتێبخانـە و کتێبفرۆشـیی شـارەکان بـەدوای ئـەو نووسـەرە سـەیر و کتێبـە دەگمـەن و تەمومژاویانـەدا گـەڕاون و ڕاپۆرتـی وردییـان لەبارەیانـەوە نووسـیوە و بـۆ ئـەم دەزگا نهێنییەیـان نـاردووە، ئەویـش لەڕێـگای تۆڕێـك لـە سـیخوڕ و ڕاپۆرتنووسـەوە، کـە لەزۆربـەی شـار و پایتەختەکانـی دنیـادا بڵاوببوونـەوە، هەسـتمکرد بـەرەو دنیایەکـی پـڕ ڕاز و ترسـناك هەنـگاو دەنێـم. دنیایـەك سـیخوڕ و بکـوژی کارامـە و چـالاك خولقاندوویانـە و ڕاوی ئـەو کتێبانـە و نووسـەرە نادیارەکانیـان دەکـەن. بێئـەوەی دڵنیابـم لـە گەڕانـەوەم لـەو سـەرزەمینە دۆزەخییـەی ئـەو دەزگایـە خولقاندوویەتـی، بەوپێیـەی دواتـر بـۆم دەردەکەوێـت، هێشـتا ئـەو دەزگایـە، یاخـود هاوشـێوەی ئـەو دەزگایـە، لـە زۆر شـوێنی دنیـادا مـاوە و بـەوردی کاردەکات، ئەگەرچـی ئەندامەکانـی سـیمایان نییـە و ناناسـرێن و وەك تارمایـی، ڕەفـە و باوەڵـە پـڕ لـە کتێبـەکان، بـەدوای نووسـەرە نەناسـراوەکاندا دەپشـکنن. پاشـان زانیشـم ئـەو دەزگایـە مێژوویەکـی کۆنـی هەیـە و تەنهـا پەیوەسـت نییـە بـە نازییەکانـەوە. هەربۆیـە کاتێـك ویسـتم بەسـەرهاتی ئـەو کتێبنووسـە نادیار و نەناسـراوانە بنووسـمەوە، کـە زۆربەیـان لەلایـەن بکوژانـی نەناسـراو و بـێ سـیمای ئـەو دەزگایـەوە کـوژراون، بڕیارمـدا دوای نووسـینی هەربەشـێك لـەم کتێبـە، نووسـخەیەکی بەدزییـەوە بنێـرم بـۆ (ع.م)ی هاوڕێـم، تـا لـە فەوتـان دەربـازی بکـەم، یاخـود ئەگـەر پیـاوە بـێ سـیماکانی ئـەو دەزگا نهێنییـە توانییـان شـوێن پێـم هەڵبگـرن و بمدۆزنـەوە، ئـەوا ئەوەنـدەی بتوانـم، بەشـەکانی ئـەم کتێبـە، لەفەوتـان ڕزگار بکـەم و چەنـد مردنێکـی گومانـاوی و کوشـتنی نهێنـی، لەژێـر تـەپ و تـۆزی مێـژوودا دەربهێنـم. هەرچـۆن دوای چـل سـاڵ لـە مردنـی تەمومژاویـی پابلـۆ نێـرودا بـەوەی

لـە ١٩٧٣دا ژەهرخـواردوو کرابێـت، وادەکات گۆڕەکـەی هەڵبدرێتـەوە و پشـکنین بـۆ ئێسـك و پروسـکەکەی بکرێـت، وەك ئـەوەی گومـان بکرێـت لـەوەی مردنەکـەی پەیوەنـدی بـە کاری ئـەو دەزگا نهێنییـەوە هەبێـت و ئـەوان کوشـتبێتییان.

***

مریـەم هـەر دوای خوێندنـەوەی ئـەو بەشـە، هەسـتیکرد خـەوی دێـت. لەوکاتـەدا بیریکەوتـەوە، تـا ئێسـتا شـێرکۆ نەگەڕاوەتـەوە بـۆ ماڵـەوە. ئەگەرچـی ئـەم ئەمڕۆ بەو مەبەستە ماڵەکەی چۆڵ نەکردبوو، بەڵام زانی ئەگـەر شـێرکۆ بگەڕایەتـەوە، ئـەوا دەستنووسـەکەی لەگـەڵ خۆیدا دەبرد. نەیویسـت بیـر لـەوە بکاتـەوە ئێسـتا دەبێـت لـە ماڵـی کـێ بێـت؟ بڵێـی لای ماریـا یاخـود کەسـێکیتر نەبێـت؟ نەیوسـیت خـۆی بـەو پرسـیارانەوە سـەرقاڵ بـکات، بەڵـکوو چـوو پاڵـکەوت و ئـەو ماوەیـەی تـا چـاوی چـووە خـەو، بیـری لـە پەیوەنـدی نێـوان خۆشەویسـتی و موڵـکداری دەکـردەوە. ئەگەرچـی پێشـتر بەهـەر بیانوویـەک بێـت، نەیهێشـتبوو لـە ئـاکام منداڵـی ببێـت، چونکـە بـۆ خـۆی دەیزانـی هەرئەوەنـدەی جێـگا قاچـی خـۆی لـەم وڵاتـەدا کـردەوە، ئـەوا لێـی جیادەبێتـەوە، هەربۆیـە هەرجارێـک لـە باسـی منـداڵ خسـتنەوەدا، بیانوویەکـی دەهێنایـەوە و بـەدزی ئاکامـەوە، حەپـی بەکاردەهێنا. ئیتـر وا ڕێککـەوت تـا ئێسـتاش منـداڵ دروسـت نـەکات، بەڵام وەک ئافرەتێـک لـە نهێنـی خۆشەویسـتی دایـک بـۆ منداڵەکـەی تێدەگەیشت. کـە چـۆن لەگـەڵ ئـەو خۆشەویستییە زۆرەدا، سـەرئەنجام دایک ڕازی دەبێت بـەوەی منداڵەکـەی کەسـێکیتری خـۆش بووێـت و لەگەڵیدا بڕوات. بەتایبەت کوڕ، کـە ئامادەیـە لەبـری دایکـی، ئافرەتێکیتـری خـۆش بووێـت. لـەم کاتـەدا ئـەو شـەڕ و ئاژاوانـەی بیرکەوتـەوە، کـە بـەردەوام لەنێـوان دایکـی و ئەو براژنەکەیـدا هەبـوون و بزەیەکـی بـۆ کـرد.

مریەم بەخۆی وت: ئارەزووی موڵکداری، خۆشەویستی ناکوژێت؟ چونکە مرۆڤ کاتێک دەتوانێت خۆشەویستی بکات، کە توانای هەڵبژاردنی هەبێت. ئەگینا بە ناچارکردن، هیچ مانایەک بۆ خۆشەویستی نامێنێتەوە. دەزانم شێرکۆ هێمنە، بەڵام هیچ پاساوێک نییە بۆ بێدەنگی ئەمجارەی و تەنها وشەیەکیشی نەوت. وەک ئەوەی من هیچ بایەخێکم نەبێت لە ژیانیدا.

بەنیازی ئەوەی تەلەفوونی بۆ بکات، کەمێک خۆی جوڵاند. بەڵام هەرزوو پەشیمان بوەوە و هەوڵیدا بیر لەو چەند رۆژە پشووەی بکاتەوە، کە مابووی. بەدەم سەرزەنشتکردنی خۆیەوە، بەوەی خۆشی نەفام هاتە بەرچاو، کە لەسەر شتێکی سادە، بڕیاری جیابوونەوەیدا. حەزیدەکرد زوو ڕۆژ ببێتەوە. چونکە هەستیدەکرد دوای هۆگربوون بەکەسێکەوە، ئیدی بە تەنیا شەوەکان قورس و بێزارکەر تێدەپەڕن. ئەگەر نەگەڕایەوە؟ وای بە خۆی وت و نەیویست بیر لە وەڵامی ئەو پرسیارە بکاتەوە، هەربۆیە بێویستی خۆی دەستی بەرەو جێگاکەی شێرکۆ درێژکرد و بیری لەو دوو فەسڵە دەکردەوە، کە خوێندبوونییەوە، بێئەوەی شتێکی ئەوتۆیان لێتێبگات. بەخۆی وت: ئەم کەسە هێمنەی من ناسیومە، دەیەویت باسی چی بکات؟ ئەم دەزگا نهێنییە چییە و ئەی بۆ باسی مەترسی دەکات، وەک ئەوەی بترسێت کەسانێک چاودێری بکەن؟ بڵێی ئەم شتانە نووسینی خۆی بن، یا...

هەستیکرد ترس وەک تەم لەسەر دڵی دەنیشێت. بەخۆی وت: بڵێی ئەو ترسە سەرچاوەکەی ئەوەبێت هێشتا شێرکۆم خۆشدەوێت؟

***

# پاش نیوەڕۆی ١٣ی سێپتەمبەر

شێرکۆ زەنگی لێنەدا. مریەم تا درەنگ لەناو جێدا مایەوە و جارجار بۆ دڵنیابی سەیرێکی مۆبایلەکەی دەکرد. پێش ناسینی شێرکۆ، وا هەستیدەکرد، ئەو ژیانە ژیاوە، کە خۆی ویستوویەتی و ئەوەی لە ژیاندا ویستوویەتی، کردوویەتی و پەشیمان نییە لێیان. بەڵام ئەوەی ڕادەبوورێت، تەنها دەبێتە بیرەوەری و ناتوانێت ئەو بۆشاییانەی ناومان پڕ بکاتەوە، کە ئێستا هەمانە. هەروەک ئاگرێک وایە، لە ڕۆژێکی سارددا چەند بیری لێبکەینەوە، ناتوانێت گەرممان بکاتەوە. خۆشەویستی، پێکەنین، سێکس و هەموو ئەوەی ڕادەبوورێت، دەبنە یادەوەری و هیچیتر. هەربۆیە مرۆڤ بوونەوەرێکی برسییە و هەست بە تێربوون ناکات. لە خۆشەویستییەک دێتە دەرەوە، هەوڵی دۆزینەوەی کەسێکیتر دەدات. دوای نووستن لەگەڵ کەسێکدا، هەوڵی دووبارە کردنەوەی دەدەین. بەخۆی وت: عەشقێک تا مردن بمانبات، تەنها لە داستان و فیلمەکاندا هەیە.

کاتێک لە هەندێک ئیشی ماڵەکە بووەوە، کە زیاتر بۆ خۆ سەرقاڵکردن خەریکیان بوو، پارچەیەک نانی بە پەنیرەوە خوارد و قاوەکەشی هەڵگرت لە دووکانێک بیکڕێت و بەدەم ڕێگاوە بیخواتەوە. حەزی دەکرد زوو ئەم ماڵە بێدەنگە بەجێبهێڵێت. لەناو دەرگاکەدا گەڕایەوە و چوو بەشێک لە دەستنووسەکەی هێناو کردییە ناو جانتا چەرمە گەورەکەی شانی، تا ئەگەر تاقەتی هەبوو، بەدەم ڕێگاوە و لەناو میترۆدا بیخوێنێتەوە. یا

ئەگەر وا ڕێکەوت و گونجا لەلای ڕووناک بمێنێتەوە، ئەوا دەتوانێت ئەو بیخوێنێتەوە.

تا گەیشتە وێستگەی شەمەندەفەرەکە، بیری لەوە دەکردەوە، کە پێشتر بەخۆی وت لە ڕابردووی خۆی پەشیمان نییە. کاتێک پارەی قاوەکەیدا، بەخۆی وت: ئێمەی مرۆڤ هەمیشە وا خۆمان دەردەخەین لە ڕابردوومان پەشیمان نین، چونکە ئەمە پاساوێکە بۆئەوەی بۆ بەرانبەری بسەلمێنین، کە بە قەناعەتی خۆمانەوە ژیاوین و کەسە ترسنۆک و ڕاڕاکان لە شتێک پەشیمانن، کە کردویانە. ئەوکاتە هەستیکرد لەشی لە شەرمدا گەرم داهات، چونکە ئەوکاتەی بیرکەوتەوە، کە ئاکامی ناسی و دەیزانی لەپێناو گەیشتن بە خۆرئاوا، درۆی لەگەڵ خۆی و ئەویشدا کردووە. بەڵام ئەی بۆ دەبێت بەخۆم بڵێم پەشیمان نیم لە ڕابردووم؟ خۆ من فریشتە نیم و مرۆڤم، مرۆڤیش هەڵە دەکات. پاشان خۆ ناکرێت لەسەر ئەو ڕابردووەم لێپرسینەوەم لەگەڵ بکرێت. کێ لێپرسینەوەم لەگەڵ بکات؟

کاتێک لە شەمەندەفەرەکەدا دانیشت و ویستی دەستنووسەکە دەربهێنێت، پەرداخە قاوەکەی لەدەست کەوت و ئاگا لەبەرخۆیەوە جنێوێکیدا. ناچار هەستا و شوێنەکەی گۆڕی. تا خۆی لە چاوی ئەو چەند کەسەی دەوری بشارێتەوە، کە بەدیقەتەوە سەیریان دەکرد. دەستی بە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە کرد.

***

# ڕێگا یەکتربڕەکان
# زیاد لە هۆکارێک هەیە بۆ یەکترناسین

لەم بەشەدا باس لەو ڕێکەوتە دەکەم، بێئەوەی مەبەستم بووبێت، تێیدا دەستم دەگاتە نهێنییەکی گەورە، ئەویش کڕینی کتێبێکی سەیرە و لەو ڕێکەوتەشەوە ماریا لەهەمان ڕۆژدا دەناسم، کە بەشدار دەبێت لە ڕووداوەکانی دواتردا. من هەمیشە ژیانم وەك دەریایەکی شێت بینیوە، کە فڕێدرابینە ناوییەوە و تیایدا زۆر ڕێکەوت چاوەڕوانمان بێت، بێئەوەی بیرمان لێکردبێتنەوە. ئیدی ژیان وایە و زۆر بەو پەڕە دەکات، بەڕێکەوت لە باڵندەیەکی تیژ تێپەڕ بەربێتەوە و شنە بایەکی، بتوانێت بە ئاراستەیەکیتردا بیبات. چارەنووسی منیش ئاوا بوو. ئەگەرچی لەکاتی خۆیدا نەمدەزانی ئەو ڕێکەوتە وا دەکات ژیانم بە ئاراستەیەکیتردا بڕوات. عاشقەکان باشترین کەسانێکن لە نهێنی ڕێکەوت تێبگەن.

یەکێـك لـەو ڕۆژە بێزارکەرانـەی سـەرەتای پاییـز بـوو، کـە لەنـاکاو کـەش و هـەوا گـۆڕا و بـاران بەخـوڕ دەسـتی بەبارینکـرد، کاتێـك خـۆم بـەو کتێبفرۆشـییەدا کـرد، کـە کتێبـی کـۆن و دەسـتی دوو دەفرۆشـێت، ئیـدی چارەنووسـی مـن بـە ئاراسـتەیەکیتردا ڕۆیشـت. مـن دەزانـم لـە ژیانـی هـەر کەسـێکدا سـاتگەلێك هـەن، ئەگـەر هاتـوو بەدوایانکـەوت، ئـەوا ئیـدی لـەدوای ئـەو سـاتەوە، مرۆڤەکـەی پێشـوو نابێـت. عاشـقە مەزنەکانیـش ئەوانـەن بـێ هیـچ نەخشـەیەك، دەشـێ لـە خەونێکـەوە یاخـود لـە بینینێکـەوە، گەرداوێـك لـە ژیانیانـدا هەڵبـکات و ئیـدی تـا مـردن مرۆڤەکـەی پێشـوو نەبـن. هەرچـۆن دەشـێ خوێنـەر، بـازرگان، دز و شـاعیر و هەرکەسـێکیتر، سـاتێکی وا لەچـارەی نووسـرابێت. وەك چـۆن بەسـەر کـوڕە قـژ خاوەکـەی گەڕەکماندا هـات.

چیرۆکـی کـوڕە قـژ خاوەکـە: هەبـوو نەبـوو لـە گەڕەکەکەمانـدا کوڕێکـی دڵپـاك و خۆشـخەیاڵ هەبـوو، کـە تـا ئێسـتا و دوای تێپەڕینـی ساڵانێکی زۆر، وێنەیـم هـەر لەبەرچـاوە. ئـەو کـوڕە ماڵیـان دوو کـۆڵان لـەولا ماڵمانـەوە بـوو، دوای ئـەوەی سەرسـام بـوو بـە خەونـی گۆڕینـی دنیـا، بـووە بکوژێکـی کارامـە و ئیـدی مرۆڤەکـەی ئەوسـا نەمـا، کـە ناسـیبوومان. بیرمـە لەکۆتایـی دەیـەی حەفتـای سـەدەی ڕابـردوودا، زۆرجـار ئـەو کـوڕە قژێکـی خـاوی بەسـەر ناوچەوانیـدا بەردەدایـەوە و بـە بیجامەیەکـی خەت خەتـەوە لەبـەردەرگا دادەنیشـت و بـەدەم گوڵەبـەڕۆژە خواردنـەوە سەیری ئێمـەی منداڵانـی گەڕەکـی دەکـرد، کـە خەریکـی یاریکـردن بوویـن، تـا ڕۆژێـك دراوسـێیەکی هاوتەمەنـی خـۆی باسـی سـتەم و چەوسـاندنەوەی کـوردی بـۆ دەکات بەدەسـتی داگیرکـەران. ئیـدی لـەوە بـەدوا ئـەو کـوڕە دەبێتـە کەسـێکیتر. دیـارە زۆربـەی مرۆڤـەکان لـەو تەمەنـەدا خـەون بەگۆڕینـی دنیـاوە دەبینـن و شـۆڕشـەکانیش بـۆ بەردەوامبوونیـان، پشـت

بەو خەونە دەبەستن کە لەخەیاڵی هەر گەنجێکدا بڵێسە دەدات. ئیدی دوای ماوەیەك کوڕە گەنجەکە دەبێتە ئەندامی حزبێکی بەرهەڵستکار و ناوێکی خوازراو وەردەگرێت و بۆ گۆڕینی دنیا بەو شێوەیەی لە خەیاڵیدایە، دەست لە کوشتنی هیچ نەیارێکی حیزبەکەی ناپارێزێت و لە شاردا بە کاری کووشتنی نهێنییانەی نەیار و دوژمنەکانی حیزب هەڵدەستێ. تا بەیانییەك ئەوکاتەی قوتابی ناوەندی بووم و دەچووم بۆ قوتابخانە، لاشەکەیم بینی لە قەراغ شیوەکەی گەڕەکمان، لە خوێنی خۆیدا گەوزابوو. ئەو بەیانییە جانتا پڕ لە کتێبەکانم فڕێدا و بەراکردن گەڕامەوە و بە هەناسەبڕکێ ئەو هەواڵەمدا بە دایکم لە دەیەی هەشتای سەدەی ڕابردوودا، هەر وامانئەزانی دنیا هەریەك دنیایە و یەك خەونیش هەیە بۆ گۆڕینی. هەربۆیە زۆرجار ڕێکەوتی شەڕ و کوشتنی بێڕەحمانەی نێوان حیزبە سیاسییەکانمان دەکرد و دەمانبینین چۆن دڵڕەقانە دەست لە خوێنی یەکتر ناپارێزن. وەك ئەوەی دەجەنگا، مرۆڤەکان نەبوونێت، بەڵکوو خەونەکانیان بوونێت.

لەژیانی هەریەکێکدا ساتگەلێك هەن، هەرچۆن بەسەر ئەو کوڕە گەنجەدا هات، چارەنووسمان بۆ ئەبەد دەگۆڕێت. بەلام ئەوەی لەدوای ئەو ڕۆژە باراناوییەی سەرەتای پایز لە مندا گۆڕا، ژیانم بوو نەوەك خۆم. بەوەی ژیانم ئاراستەیەکی دیکەی وەرگرت. من ئەو ڕۆژە کە خۆم کرد بە دووکانی کتێبفرۆشییەکەدا. هیچ نەخشە و پلانێکم نەبوو،

دەشێ یەکێك لە پەنهانترین و پڕ نهێنیترین شوێن، کتێبفرۆشی و کتێبخانەکان بێت. ئەوەی جیهانیشی دۆزیبێتەوە، کتێب بوو. کتێبخانەکان وێنەیەکی بێبڕانەوەن، بەوپێیەی هەر کتێبە و کۆمەڵێ نهێنی لەخۆیدا حەشارداوە، یاخود بەسەر نهێنیتردا دەکرێتەوە و مرۆڤیش بریتییە لە کەڵەکەبوونی کتێب و دەستنووسەکان. ئەوەی

بیردەکاتەوە، کتێبەکانن، هەرچۆن ئەوەی مرۆڤ و دنیا دەگۆڕێت هەر کتێبەکانن. ئەمەش وام لێدەکات بڵێم هەموو شتێك کۆتایی هەیە، تەنها کتێبەکان نەبێت، کە بێکۆتان.

من خۆم دەناسم و دەزانم یەکێکم لەوانەی شەیدای کتێبن و زۆرترین کاتی دەستبەتاڵیم لەناو کتێبخانەکاندا بەسەردەبەم، سەیری پێرستی کتێبەکان دەکەم و لە چاپ و جۆری لاپەڕەکانیان ورد دەبمەوە، تەنانەت بە بۆن تەمەن و مەرەکەبەکانیان دەناسمەوە. من بەڕادەیەك سەراسیمەی کتێبم، کە خەون بەوەوە دەبینمماڵەکەم کتێبخانە گشتییە بازنەییەکەی ستۆکهۆڵم، یاخود ئەوەی ئەسکەندەرییە بوایە و هەموو تەمەنم لەناو دێر و ڕاڕەوەکانیدا بەسەر ببردایە. زۆرجار گوماندەکەم ئەم شەیدابیەی من بۆ کتێب، جۆرە نەخۆشییەك بێت، کە هەرگیز نامەوێت چاك ببمەوە لێی، چوونکە من ئارەزووم لەوەیە لە خەیاڵی کتێبەکاندا... لەگەڵ عاشق و خیانەتکار و شۆڕشگێڕی ناوکتێبەکاندا بژیم، نەوەك لە واقیعدا. تەنانەت بیرەوەریی من لەگەڵ ئەو شارانەی پیایاندا ڕۆیشتووم، یاخود سەردانم کردوون، ناگەڕێتەوە بۆ شەقام، باڵەخانە، یاخود ئافرەت و شوێنی کات بەسەربردن. بەڵکوو پەیوەندیی بە کتێبخانەکانیانەوە هەیە، ئەگەر هیچیشم لە زمانەکانییان نەزانیبێت، هەر حەزمکردووە بەنێوان ڕەفەکانیاندا بگەڕێم و سەیری کتێبەکانییان بکەم. کتێبخانەکان چەند بەو پارچە موزیکانە دەکەن، کە لەگەڵ گوێگرتنمان لێیان، ئیدی هەستدەکەین شتێك لە ئێمەدا دەگۆڕدرێت. من هەمیشە خووم وابووە و چووبێتمە هەر شارێکەوە، یەکەم شوێن بەدوای کتێبفرۆشییەکانیدا گەڕاوم و سەردانم کردوون، حەزمکردووە کتێبخانە گشتییەکانیان ببینم و لە نەخشەسازی و جۆری کتێب و چاپەکانییانەوە، توانیومە وێنای شارەکە بکەم.

ناسینی من بۆ ماریا، هەر دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەو شوێنە پڕ

ڕازانەی شەقامی (درۆتنین گاتان)، کە کتێبی کۆن و دەستی دوو دەفرۆشن. ئەو کتێبانەی خاوەنەکانییان لەپێویستیدا دەیانفرۆشن، یاخود میراتگرەکان لەبەرئەوەی پێویستیان بە شوێنەکانییانە، دەیانەوێت لە کۆڵیان ببنەوە و جێگاکانیان بۆ شتێکیتر بەکاربهێنن. ئیدی ڕۆژێکی باراناوی بوو، کە ماریام لەوێدا ناسی... لەو کتێبفرۆشییەی دەکەوێتە کۆلانێکی باریکی سەر شەقامی درۆتنین گاتان و بەچەند پلەیەك بۆی دادەبەزیت، کە زیاتر پیرێکی ئارام و لەسەرخۆی لێدادەنیشت و هەمیشە کوپێك قاوە لە بەردەمیدا بوو. ئەگەر کەسێکیش پرسیاری لێنەکردایە، ئەوا چاویلکەکەی دانەدەگرت و هەر سەرقاڵی خوێندنەوە دەبوو. ئافرەتێکی باریکیش، کە پێدەچوو لە پەنجاکانی تەمەنیدا بێت و زیاتر بە تەنوورەیەکی درێژەوە دەبینرا، لەوێ کاری دەکرد و کتێبەکانی بەپێی بەشەکانییان جیادەکردەوە و لەسەر ڕەفە تەختەکان دایدەنان.

ئێستاش بیرمە پێش چەندین ساڵ، کاتێك ڕێم کەوتە ئەو کتێبفرۆشییە و بەدوای ڕۆمانێکی بچووکدا دەگەڕام، ویستم پرسیار لەو پیاوە بکەم ئێستا پیرتر بووە، وتی: ولیەم. ئیدی تێگەیشتم ناوی (ولیەم)ە و وەك بۆی باسکردووم، خانەوادەکەیان زیاتر پیشەیان کتێبفرۆشی بووە و ئەم پیشەیەی بە میرات بۆ ماوەتەوە. ئیدی لەوە بەدواوە زۆرجار ڕێکەوتووە بۆ ماوەیەکی کورت من و ولیەم قسەمان بەیەکەوە کردبێت.

لەدوای گەیشتنم بەم شارە، بەردەوام هاتوچۆی ئەم کتێبفرۆشییەم دەکرد، کە لەبەر نزمیی دەرگاکەی، دەبوو لە چوونە ژوورەوەدا، سەر دابنەوێنیت. لەم کتێفرۆشییەدا کتێبم بە نرخێکی هەرزان دەستدەکەوت. هۆیەکیتریش هەیە بۆ ئەم ئارەزووە زۆرەی من بۆ کتێبخانەکان هەمە و دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵیم، کە لە ئێستادا نامەوێت هیچی

لەبارەوە بڵێم، چوونکە پێدەچێت دواجار ئەوەی لەپشت گێڕانەوەی هەموو ئەم بەسەرهاتانەوە وەستابێت، ئاشکراکردنی ئەو نهێنییە بێت و کاتێکیتر هەوڵی گێڕانەوەی دەدەم.

هەمیشە چوونی من بۆ کتێبخانەکان ئەو هەستەی داومەتێ، کە بەیانییەکی زووی پڕ لەتەم، لە شارێکی نەدیدە و نەناسدا پیاسەدەکەم، بە کووچە و کۆڵانە زۆر و زەبەندەکانیدا دەگەڕێم، بێئەوەی ناونیشانێکی دیاریکراو لە خەیاڵمدا بێت. من لە شارێکدا دەبووم، کە هەر دەروازەیەکی بەسەر چەندین ڕاز و نهێنیدا دەکرێنەوە. ئەو دەروازانەش کتێبەکانن.

ڕۆژێکییان ولیەم بە تەنیا بوو، پاش کەمێک وردبوونەوە، وتی: تۆ ئێستا لە وڵاتێکی ڕۆژئاوا دەژیت، چ جیاوازییەک دەبینیت لەگەڵ ڕۆژهەڵاتدا؟ منیش لەبەرئەوەی نەمدەتوانی بە سویدی باش قسەبکەم، بەشەرمەوە باسی ئەوەم بۆ کرد، یەکەم جیاوازی هەستم پێکردبێت، زەمەنە. پێچەوانەی ئەوەی بۆی دەچین، زەمەن لە وڵاتی من خێرا و پڕ لە ڕووداوە، بەڵام لێرە زەمەن زۆر خاو دەڕوات و ئاساییە مرۆڤ بزانێت دوای شەش مانگی تر نیوەڕۆکەی لە کام چێشتخانە نان دەخوات. ئەم خاوی زەمەنەش، سزایەکی سەختی پەناهەندەیە کاتێک دەگاتە ئێرەو لە کەمپێکدا دایدەنێن. وای بۆ دەچم کاری سەرەکیی کەمپەکانیش کووشتنی ئەو زەمەنە خێرایەی ناومان بێت، تا لەگەڵ ئەم زەمەنە خاوەی ئێرەدا ڕابێین. بۆ نموونە کەسێک لە وڵاتێکی پڕ کێشەی ئەمریکای لاتینەوە هەڵدێت، کە ڕۆژێک خەباتی کردووە ڕژێمێک بگۆڕێت و ژیانی پڕ لە جووڵە و ڕاکەڕاك و خۆحەشاردان بووە، بەڵام لێرە لە کەمپێکدا دایدەنێن تا کاتەکانی بەدەم هەڵهاتن و ئاوابوونی خۆرەوە بەسەربەرێت. یاخود لە گۆڕانی وەرزەکان وردبێتەوە. ئەمەش سزایەکی لەسەرخۆیە، تا بەزەمەنی ئێرە ڕادێت. لەوباوەڕەدام

ڕاهاتن لەگەڵ جۆری خواردن و پۆشاك و ئەو شتانە، ئاسانترە وەك لە ڕاهاتن بەم زەمەنە خاوە.

***

من حەزم لە ڕۆژی تەڕوتووش و بارانـاوی نییە. ئەو ڕۆژەش تازە گەیشتبوومە سەرەتای شەقامی (درۆتنین گاتان)، کە باران دەستی بەباریـن کرد و هەر زوو شەقامەکان لە ڕێبوار چۆڵ بوون. لەژێر ئەو ئاوە بارانەدا، وام بەباش زانی خۆم بگەیەنمە کتێبفرۆشییەکەی ولیەم و کەمێك خۆم بە سەیرکردنی کتێبەکانەوە سەرقاڵ بکەم، تا بارانەکە خۆش دەکاتەوە. ناو کتێبخانەکە چۆڵ بوو. ولیەمیش، کە هەمیشە بە خۆی و چاویلکە و ڕیشە سپییەکەیەوە سەری بەسەر کتێبێکدا دادەنەواند و بێئاگا لە دونیا، خەریکی خوێندنەوە دەبوو، ئەو ڕۆژە لە جێگاکەی ئەو، کوڕێکی گەنج دانیشتبوو، کە پێشتر ڕێکەوتیم نەکردبوو. دوای ئەوەی بەسەر سڵاوم لێکرد، بەرەو بەشی چیرۆك و ڕۆمانەکان ڕۆیشتم.

کتێبفرۆشییەکە شێوەیەکی باریك و درێژی هەیە، کە جگە لەوەی تا بنمیچەکەی، ڕەفەی پڕ لە کتێب بوو، لە ناوەڕاستی دووکانەکەشداو بەهەمان ئاراستەی درێژییەکەی، ڕەفەی باریك و درێژ هەبوون و کتێبفرۆشییەکەیان کردبوو بە چەند ڕاڕەوێکی باریکەوە، کە هەر هێندە بواری تێپەڕینی کەسێکی دەدا. ئەو ڕۆژە دەنگی موزیکێکی نەرم تێکەڵ بە بۆنی قاوە، دەڕژایە ناو کتێبخانەکەوە.

هێشتا لە دەرەوە باران بەخووڕ دەباری و منیش کاتێکی زۆرم بەدەستەوە بوو، هەربۆیە بەوردی سەیری ناونیشانی ڕۆمانەکانم دەکرد و جارجار یەکێکیانم لەناو ڕەفەکان دەردەکرد و چاوێکم پێدا دەخشاند.

ئەو ڕۆژە لەوێدا ڕێکەوتی ماریام کرد و ڕێگای ژیانمان یەکتریی بڕی، دوای ئەوەی لە گۆشەی بنەوەی دووکانەکەدا، کە کەمێك ڕووناکی

تێیدا کزبوو، من ناونیشانی کتێبێك سەرنجی ڕاکێشابووم بەناوی «چەتەکانی خەیاڵ - ڕێبەری کتێبنووسە نەناسراوەکان»ەوە و خەریکی خوێندنەوەی پێڕست و بەرگی پشتەوەی بووم، کاتێك ماریای ڕەنگ ژاکاو و لاواز، کە تیشێرتێکی ڕەش و پانتۆڵێکی جینزی لەبەردابوو، نائاگا خۆی پێمدا کێشا و لەژێر لێوەوە داوای لێبوردنی کرد و بەو ڕەنگە زەرد و غەمبارەیەوە، جانتا زەیتوونییەکەی هەڵکێشایەوە و سەرداخستوانە لەسەرخۆ دوورکەوتەوە. بێئەوەی کەسمان بزانێت هەر ئەو ئێوارەیە بەڕێکەوت لەسەر یەك مێزی قاوەخانەیەك دادەنیشین و ئیتر زۆر ڕۆژی تەمەنمان تێکەڵ بەیەکتر دەبێت، دوای ئەوەی ماریا لە قاوەخانەکە، لەبەر نەبوونی شوێن، داوای یارمەتیم لێدەکات تا بۆ خواردنەوەی قاوەکەی، لەسەر ئەو کورسییە چۆڵەی بەرانبەرم دابنیشێت. بێئەوەی بزانێت من هەر ئەو کەسەی ناو دووکانی کتێبفرۆشییەکەم، تا سەر هەڵدەبڕم و سەیری دەکەم.

من ئەو ڕۆژە کتێبێکی سەیر و ئافرەتێکی سەیر و نهێنی ئامێز هاتنە ژیانمەوە، دوای ئەوەی بڕیارمدا کتێبی «چەتەکانی خەیاڵ» بکڕم و چوومە لای کوڕە گەنجەکە پارەکەیمدا و ئەویش وەك پیشەی هەندێك کتێبفرۆشی دیکە، ناوی کتێبەکە و نووسەرەکەی لە لیستی کتێبە فرۆشراوەکاندا نووسی و پارەکەی لێوەرگرتم. پاشان بزەیەکی بۆ کردم و وتی: بارانەکە خۆشی کردۆتەوە. منیش بۆ دڵنیایی سەیرێکی دەرەوەم کرد و تەنها بزەیەکم بۆ کرد. ڕۆژانێك دوای ئەو ڕێکەوتەی ماریام تێدا بینی، ئەویش پێیوتم، کە هەر ئەو ڕۆژە هەستی کردبوو پیاوێکی سەیر هاتۆتە ژیانییەوە. پیاوێك لە جوگرافیایەکی دوورەوە هاتووە و وەك ڕەشەبا لەژیانی ئەمدا هەڵدەکات.

***

مریەم سوورهەڵگەڕا بوو. هەستیدەکرد دڵی خێراتر لێدەدات و هەوای ناو شەمەندەفەرەکە دەیخنکێنێت. هەر کە شەمەندەفەرەکەش وەستا، بێئەوەی بۆی گرنگ بێت گەیشتۆتە کوێ، بەپەلە دابەزی و لەسەر کورسییەکی چاوەڕوانی دانیشت. دەیزانی کاتێک لەو بەشەدا ناوی ماریای خوێندەوە، ئاوا دۆخی تێکچوو. بڵێی ماریا هەبێت، یاخود خەیاڵێکە و ئەو شەوە بەدەمی شێرکۆدا هات؟ ئەوەی ئەم ڕۆمانە دەگێڕێتەوە، شێرکۆیە یا کەسێکیتر؟ لەوکاتەدا حەزی دەکرد بگەڕێتەوە و نەچێت بۆ ماڵی ڕووناک. کە بیری لە تەنیایی ماڵەکە کردەوە، پەشیمان بوەوە. بەڵام بیرۆکەیەکیتری بۆ هات و هەر کە شەمەندەفەرێکیتر هات، بەنیازی ماڵی ڕووناکی هاوڕێی سەرکەوت. ئەگەرچی هەستی بە ماندوێتی دەکرد.

***

یەکەم شت دوای دەرگا کردنەوە، ڕووناکی بینی و دوای سڵاوکردن و باوەش بەیەکداکردن، دەنگی شەوبۆ و هەلالە لە ژووری دانیشتنەکەوە هات، کە یەکێکیان وتی: بەرەلا ئەوە بۆ وا درەنگ گەیشتیت؟ مریەم زانی ئەوە دەنگی هەلالەیە و هەستیکرد ئەم گاڵتەکردنە لەم ماندوێتییەیدا، سەرەتایەکی باش نییە. هەربۆیە هەوڵیدا خۆی لە گاڵتەکانییان لابدات، چونکە ئەمە یەکەمجاری نەبوو لەگەڵیاندا کۆببێتەوە و دەیزانی کاتێک پێکەوە دەبن، ئەوەی هەیە و نییە دەیڵێن. لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەگەرمی باوەشی بە شەوبۆ و هەلالەدا کرد، کە ساڵانێکی زۆرە دەیانناسێت. بەتایبەت هەلالە، کە سەرەتا هەردووکیان لە شارێکی باکووری سوید دەژیان و ئەویش دوای جیابوونەوەی لە مێردەکەی، گواستییەوە بۆ ستۆکهۆڵم و لەوکاتەشەوە پەیوەندییان بەردەوامە. ڕووناک بە پێکەنینەوە وتی: ئێستا تۆ لەنێوان سێ بێوەژندایت، کە هەر بە بۆنی پیاو مەست دەبن. هەلالە هەڵیدایە و وتی: مەگەر خۆت، ئەگینا من هەفتەی

پێشوو بەشی شەش مانگ خۆم لە پیاو تێرکردووە. ڕووناک گەڕایەوە و بەسەرسامییەوە وتی: ئەی بۆ باست نەکردووە؟ بابە تۆش خوا پێداویت. شەوبۆش وتی: هەفتەی پێشوو بە پاڕانەوەوە هات تا شیلەی بۆ بکەم. هەلالە بە قاقاوە وتی ئەرێ ئەو شیلەیە چی بوو، تووکی حەوت پشتیشی دەردەهێنا. کابرا ناهەقی نەبوو دەیویست بیخوات. هەلالە دەیزانی بەو قسانە، ڕووناک دەجوڵێت و کەیفی ساز دەبێت.

مریەم بێدەنگ گوێی لێ گرتبوون و هەوڵیدەدا بێتاقەتی پێوە دیار نەبێت. بەلام کە ڕووناک سەیری کرد و وتی: ئەها دادەم تێرە هیچ ناڵێت. مریەم فرسەتی هێنا و بەو درۆیەی چاوەڕێی نامەیەکی گرنگە، داوای کۆمپیوتەرەکەی لێکرد و چووە ژووری ئەودیو. خێرا چوو سەیری لاپەڕەکەی شێرکۆ بکات لە فەیسبوک و بزانێت شوێن پێی ماریا نادۆزێتەوە. بەلام بۆ ماوەیەک دەستی بە کۆمپیوتەرەکەوە وشک بوو، کاتێک بینی لاپەڕەکەی شێرکۆ داخراوە.

ماوەیەکی زۆری پێچوو، تا ڕووناک هاواری کرد و وتی: مریەم وەرە ئەم مایۆیانەم تازە کڕیوە، بزانە جوانن. کە گەڕایەوە ئەودیو، شەوبۆ وتی: ئەم مایۆ یەک تاڵیانە لە تەڵە دەچن، خۆ ئەگەر بەمانە ڕاو نەکەیت، ئەوا دەست لە خۆت بشۆ و بچۆ بۆ خانەی پیران. ڕووناکیش بەرپەرچی دایەوە و وتی: حەدت چییە ئێستاش ئەوەی من لەوەی تۆ تەڕترە. ئەگەر ڕاست دەکەیت ڕۆژێک وەرە دەچین بۆ مەلە، بزانە لە دوان کەمتر ڕاو دەکەم. لەگەڵیدا هەستا و عەزییەکەی توند نووساند بە لەشییەوە و چەند جارێک سمتی بادا.

مریەم تا ئەوکاتە لەو پرسیارە دەترسا، کە هەلالە لێی کرد و وتی: چییە وا بێتاقەتیت و هیچ ناڵێیت، خۆ عادە نیت؟ ڕووناک و شەوبۆ پێکەنین، مریەمیش هەرئەوەندەی وت کە لە دوێنێوە ژانە سەرێکی توندی گرتووە. ڕووناک وتی: تۆ قەینا کا، گرنگ ئەوەیە شێرکۆ نەیگرێت و

پێی بکرێت. هەستە کچێ بچین شتێک ئامادەبکەین. لەگەڵیدا دەستی مریەمی گرت و بەرەو مەتبەخ ڕۆیشتن.

مریەم بەدەم جنینی خەیار و کاهوەوە، هەر خەیاڵی لای ماریا بوو. دەیویست بوارێک بدۆزێتەوە و زوو بڕوات، چونکە دەیزانی ئەمانە بە ساڵ پێکەوەبن، هەر لەم ئاوازە دەخوێنن و دڵنیاش بوو دوای نانخواردن، ڕووناک بەوردی بۆ هەڵاڵەی دەگێڕێتەوە هەفتەی ڕابردوو چیکردووە و لەگەڵ کێدا نووستووە. چونکە ئەو ئارەزووییەکی زۆری لە باسکردن و گوێگرتن بوو لەوەی کەسێکیتر لەسەر جێگا دەیکات. هەڵاڵەش ئەوەی دەزانی و زۆرجار بۆ خۆی شتی پێوەدەنا و بە تام و چێژێکی زۆرەوە باسی ئەوەی بۆ ڕووناک دەکرد، کە لە جێگادا کردوویەتی.

ڕووناک هەر لەدوای کوژرانی مێردەکەیەوە لە ڕووداوێکی تەمومژاویدا لە مۆسکۆ، ساڵانێکی زۆر بوو بەتەنیا دەژیا، دوای ئەوەی دوو منداڵەکەی توانییان بچنە شوقەی خۆیان. ڕووناکیش پەیوەندیی زۆر بوو لەناو کوڕەکاندا و هەر لە گەنجی شاگرد ڕێستورانت بۆ شۆفێری تەکسی و دووکاندار و کوردانی شارەکانیتریش هاتوچۆیان دەکرد. تەنانەت جارێک لە کۆتایی نەوەدەکاندا مریەم بیری لەوە کردەوە دایکی بە قاچاخ بهێنێت، ڕووناک خەڵکی بۆ پەیداکرد لە تورکیاوە تا ستۆکهۆڵمی بهێنن. بەڵام دایکی نەیتوانی بگاتە تورکیا و لە سنووری تورکیا لەسەر هێستر کەوتبووە خوارەوە و قاچی شکابوو. بەڵام هەڵاڵە دوو جار جیاببووەوە و وەک خۆی باسی دەکرد، دوو قۆڵبڕ مێردی بوون، کە دەیانوویست بە مووچەکەی ئەم، خانوو لە کوردستان بکڕن، یا خزم و کەسی خۆیانی پێبەربکەن. هەڵاڵە زیاتر حەزی لە کاری ناو ڕێکخراوەکانی ژنان و کۆبوونەوە و خۆپیشاندانەکان بوو. ئەو هەمیشە حەزی لە گاڵتە دەکرد و زۆر زوو لە قسەکانیدا دەیوت: بەحەسرەتم لە کوردستان بوومایە لەسەر ئەم قسانە بە بەرد دەیانکوشتم. هەوڵیش ئەگەرچی وەک ئەوان

گاڵتـەی دەکـرد، بـەڵام سـەرەتای نـەوەدەکان لـە ڕێگای شووکردنەوە دێتە سوید، بـەڵام هـەر مانگێـک ناخایەنێت، مێردەکـەی لێیجیادەبێتـەوە. ئەمیش لەوکاتـەوە بیـر لـە شـوو ناکاتـەوە و مـاوەی چەنـد ساڵێک لەگەڵ کوڕێکی سـویدیدا ژیـا و ئێسـتا سـەگێکی لـە ماڵـەوە بـە تەنیـا جێهێشتووە.

ڕوونـاک بتڵێـک شـەرابی هێنـا و وتـی: دەزانـم شـەوی خواردنـەوە نییە و لەوانەیـە بەیانـی بچـن بـۆ کار، بـەڵام هـەر پێکێـک دەخۆینـەوە تـا شـەرمان بشـکێت. خۆشـی پەرداخەکانـی بـۆ پڕکـردن. لەوکاتـەدا تەلەفزیۆنەکە خۆکوژێکـی لـە سـوریا نیشـاندا، کـە پێـش خۆتەقاندنـەوەی، لەناو ئەو لۆرییـەی ئامـادە کرابـوو بـۆ تەقاندنـەوە، باسـی ڕۆیشـتن بـۆ بەهەشت و گەیشتن بـە حۆرییەکانی ئەوێـی دەکـرد و هەڕەشەشـی لـە بێباوەڕان دەکرد. هەڵاڵـە ئـاوڕی دایـەوە و وتـی: سـەیری ئەمـەش ناکەیـت... ئـا یەکێکتان ئەو کەناڵـە بگۆڕێـت.

بەدرێژایـی دانیشـتنەکە مریـەم بێدەنـگ بـوو. تەنانـەت ئەوکاتـەی باسی جل و پێڵاو کڕینیشیان کـرد، ئـەم هـەر بـە ماتییەکـەوە سـەیری دەکردن. چاوەڕێـی دەرفەتێکـی دەکـرد، هەستێت و بگەڕێتـەوە بۆ ماڵـەوە. ئەگەرچی ڕوونـاک زۆری پێـوت، بـەڵام ئـەو بەبیانـووی ئـەوەی کاری گرنگـی هەبە و هەردەبێت بگەڕێتـەوە، خواحافیـزی لێکـردن.

تـا ئەوکاتـەی مریەم گەیشـتە وێسـتگەی شـەمەندەفەرەکە، هەستی بە دڵ تەنگی دەکـرد. بـەڵام پەیوەنـدی بـە هاتنەکەیـەوە نەبـوو، چونکە دانیشتن و کۆبوونەوەکانـی ماڵـی ڕوونـاک هەروابـوون. ئـەو بەدرێژایـی دانیشتنەکە، هەر خەیاڵـی لای شـێرکۆ بـوو. لـە شـەمەندەفەرەکەدا بـۆ جـاری دووەم هەمان بەشـی دەستنووسـەکەی، بـەوردی خوێنـدەوە، وەک ئـەوەی بـەدوای مارییادا بگەڕێت

***

گاڵتەی دەکرد، بەڵام سەرەتای نەوەدەکان لە ڕێگای شووکردنەوە دێتە سوید، بەڵام هەر مانگێک ناخایەنێت، مێردەکەی لێیجیادەبێتەوە. ئەمیش لەوکاتەوە بیر لە شوو ناکاتەوە و ماوەی چەند ساڵێک لەگەڵ کوڕێکی سویدیدا ژیا و ئێستا سەگێکی لەماڵەوە بە تەنیا جێهێشتووە.

ڕووناک بتڵێک شەرابی هێنا و وتی: دەزانم شەوی خواردنەوە نییە و لەوانەیە بەیانی بچن بۆ کار، بەڵام هەر پێکێک دەخۆینەوە تا شەرممان بشکێت. خۆشی پەرداخەکانی بۆ پڕکردن. لەوکاتەدا تەلەفزیۆنەکە خۆکوژێکی لە سوریا نیشاندا، کە پێش خۆتەقاندنەوەی، لەناو ئەو لۆرییەی ئامادە کرابوو بۆ تەقاندنەوە، باسی ڕۆیشتن بۆ بەهەشت و گەیشتن بە حۆرییەکانی ئەوێی دەکرد و هەڕەشەشی لە بێباوەڕان دەکرد. هەلالە ئاوڕی دایەوە و وتی: سەیری ئەمەش ناکەیت... ئا یەکێکتان ئەو کەناڵە بگۆڕێت.

بەدرێژایی دانیشتنەکە مریەم بێدەنگ بوو. تەنانەت ئەوکاتەی باسی جل و پێڵاو کڕینیشیان کرد، ئەم هەر بە ماتییەکەوە سەیری دەکردن. چاوەڕێی دەرفەتێکی دەکرد، هەستێت و بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. ئەگەرچی ڕووناک زۆری پێوت، بەڵام ئەو بەبیانووی ئەوەی کاری گرنگی هەیە و هەردەبێت بگەڕێتەوە، خواحافیزی لێکردن.

تا ئەوکاتەی مریەم گەیشتە وێستگەی شەمەندەفەرەکە، هەستی بە دڵ تەنگی دەکرد. بەڵام پەیوەندی بە هاتنەکەیەوە نەبوو، چونکە دانیشتن و کۆبوونەوەکانی ماڵی ڕووناک هەروابوون. ئەو بەدرێژایی دانیشتنەکە، هەر خەیاڵی لای شێرکۆ بوو. لە شەمەندەفەرەکەدا بۆ جاری دووەم هەمان بەشی دەستنووسەکەی، بەوردی خوێندەوە، وەک ئەوەی بەدوای ماریادا بگەڕێت

***

# شەوی ١٣ی سێپتەمبەر

کاتێک مریەم گەیشتە ماڵەوە، هەوڵیدا خۆی سەرقاڵبکات، ماوەیەک بەرانبەر تەلەفیزیۆنەکە دانیشت و بەدەم گۆڕینی کەناڵەکانەوە، تەلەفوونی بۆ دوو هاوڕێی کرد و دەیویست تا بۆی دەکرێت درێژە بە قسەکردن بدات. درەنگانێکیش ڕووناک تەلەفوونی بۆ کرد و پرسیاری بێتاقەتی ئەمڕۆی لێکرد. بەڵام مریەم بە پاساوی نەخۆشی، خۆی لە پرسیارەکەی دزییەوە و نەیویست هیچ لەبارەی پەیوەندی خۆی و شێرکۆوە باس بکات، چونکە دەیزانی ڕووناک وەک هەمیشە قسەکانی دەباتەوە سەر سێکس و ئەمیش بەتایبەت دوای ئەوەی ئێوارە زەنگی بۆ تەلەفوونەکەی شێرکۆ لێدا و داخرابوو، هیچ تاقەتی ئەو باسانەی نەبوو.

ئێوارە یەکەم شت دوای دانانی جانتاکەی، هێشتا پێڵاوەکانی دانەکەندبوو، تەلەفوونەکەی دەرهێنا و زەنگی بۆ ژمارەکەی شێرکۆ لێدا. بەڵام هەرزوو زانی ژمارەکە داخراوە. بەرەو تەوالێتەکە چوو، چونکە هەستی کرد دەیەوێت بڕشێتەوە. ماوەیەک لەبەردەم دەسشۆرییەکەدا مایەوە و بەخۆی وت: بەڕاست من بۆ وادەکەم؟ دوای ئەو هەموو شکست و ناخۆشییەی ژیانم و سەردانی کردنی پزیشکی دەروون، من خۆم ڕاهێنا هەرگیز نەگەڕێمەوە سەر ڕابردووم و خۆمیان پێئازارنەدەم. من کە هیچم لەدەست نەیەت و شێرکۆش خۆی شاردبێتەوە، ئیدی بۆ خۆم ئازار بدەم. بەڵام هەر ئەوکاتە بەخۆشی وت: بۆ ئێمەی ڕۆژهەڵاتی، ڕابردوو

وەک ڕەگ وایە و هەرگیز ناتوانین خۆمان لە ڕەگەکانمان ڕزگار بکەین.

بەڵام ڕووناک هەمیشە ڕێگایەک دەدۆزێتەوە بۆئەوەی بیباتەوە سەر باسی سێکس و وەک مریەم چەند جارێک پێی وتبوو، لای ڕووناک خان هەموو ڕێگاکان دەچنەوە سەر سێکس، وتی: کچێ دەمویست شتێکت بۆ باسبکەم، بەڵام دوێنێ بوار نەبوو. پاشان تۆش زوو هەستایت و ڕۆیشتیت. بیرتە جارێک باسی کوڕێکم بۆ کردیت، لە خۆپیشاندانەکەی ئەم دواییەدا لە سەنتەری شار ناسیم؟ لەم ئێوارانەدا تەلەفوونی کرد و بینیم. دواتر چووینەوە لای خۆم و شەو مایەوە. مریەم بە سەرسوڕمانەوە وتی: چ زوو گەیشتنە ئەوە؟ ڕووناک بەدەم پێکەنینە درێژەکەیەوە وتی: ئێ کچێ منیش حەزم لێیەتی و تەنیایی بەرگە ناگیرێت. ئێ خۆ لە ئەفغانستان ناژین.

مریەم وەک جاران ئارەزووی بەردەوامی دان و گوێگرتنی لەو قسانە نەبوو، ئەگەرچی لەگەڵ ڕووناکدا زۆر یادگارییان بەیەکەوە هەبوو. زۆر شەو بەیەکەوە مابوونەوە و ئاگاداری زۆربەی سەرچڵییە سێکسییەکانی بوو. کاتێکیش تەلەفوونەکەی داخستەوە، وەک ئەوەی بیەوێت هەموو شتێک فەرامۆش بکات، دەستی بە خوێندنەوەی بەشێکیتری ڕۆمانەکە کرد.



## فەرشەکەی سلێیاد
## کۆبوونەوە لەسەر خەیاڵی کتێب

لەم بەشەدا دەمویست باسی هەندێک نهێنی ژیانی ماریا بکەم، چۆن لە خێزانێکدا بەتەنیا و بێئەوەی هیچ خوشک و برایەکی هەبێت، گەورەبووە و کتێب خوێندنەوە دەبێتە پەناگایەک بۆی. تا سەرئەنجام سنووری نێوان واقیع و کتێبی لەلا تێکەڵ دەبێت. هەروەها دەمویست باسی هەستی قووڵی ئەو، بە تەنیایی و ئەو ڕەشبینییە بکەم، لە پشت هەوڵی خۆکوشتنییەوە وەستاوە. بەڵام هەوڵدەدەم خۆم لەو باسانە بدزمەوە و لەجیاتی ئەوە، باسی ئەو ڕۆژە بکەم، کە لە قاوەخانەکە پێکەوە دانیشتین. چونکە لای من کاتێک تاقەتێک ڕەشبینانە سەیری دونیا دەکات، هەستدەکەم جیهان هاوسەنگی تێکچووە. ماریا یەکێک دەبێت لەو کەسانەی سنووری نێوان واقیع و کتێبیان لا تێکەڵ بووە و لەبەدی نازانێت لەو لێرەدا دەژی، یاخود لەوێ لەناو کتێبەکاندا. ئەمەش بەدبەختییەکی گەورەیە.

کاتێک من ماریام لەو ڕۆژە باراناوییەی سەرەتای پاییزدا ناسی، ماوەیەکی کەم بوو لە ئەزمونێکی سەرنەکەوتووانەی خۆکوشتن هاتبووە دەرەوە، (وەك دواتر زانیم) و هێشتا کاریگەرییەکانی لەسەر مابوو. ژاکاوی و ڕەنگی زەرد و ئەو ماندوییی و نیگەرانییە زۆرەی لە جولەی دەست و لێویدا دەبینرا، بەپەلە جگەرەکێشانی و جوڵانی چاوی بەملاولادا، ڕاستەوخۆ لەو ڕۆحە پڕ لە نیگەرانییەیەوە سەرچاوەی دەگرت، کە بەچەشنی پایزێکی درەنگ وەختی دەکرد. ئەو ڕۆژەی لە قاوەخانەکە یەکترمان بینییەوە و زانی ڕێکەوتی هەمان پیاوی ناو کتێبفرۆشییەکەی کردۆتەوە، بەخۆشحاڵییەوە دانیشت و ئەوە بووە سەرەتای یەکترناسینمان.

ئەو ڕۆژە بەهۆی بارانەکەوە، قاوەخانەکە قەرەباڵغ بوو. توانیبووم لە گۆشەیەکدا و ڕووبەڕووی جامخانەکە و ڕووە و دەرەوە جێگایەك بۆ دانیشتن پەیدا بکەم. دوای ماوەیەك لە دانیشتن، لەگەڵ ماریا کەوتمە قسەکردن و زیاتر لەبارەی کتێبەوە دواین و جار هەبوو وا ڕێکدەکەوت هەردووکمان وەك یەك سەرسامیمان بۆ کتێبێك هەبێت، ئەمەش ئەوی زیاتر خۆشحاڵ دەکرد و وای لێدەکرد بەخۆشی و پەلەییەوە لەبارەی کتێبەکەوە بدوێت و باسی بکات. قاقا لێبدات و لەگەڵیدا دەستەکانی بەیەکدا بکێشێت و خۆی بە پشتدا بخات. لەوکاتانەدا هەستمدەکرد من لەبەردەم منداڵێکدام، کە نایەوێت گەورە ببێت. وەك ئەوەی هەموو سادەییەك، بەشێکی زۆر لە منداڵێتی لەخۆیدا هەڵبگرێت. یاخود پێدەچوو کتێبەکان نەهێڵن گەورە ببێت. ئەو وتی: پێچەوانەی زۆر کەس، کە حەزدەکەن خۆیان لە کەسایەتی ناو ئەو کتێبانەدا بدۆزنەوە و وا دەزانن نووسەرەکە خەون و خەیاڵ یاخود ژیانی ئەمانی نووسیوەتەوە و بەرجەستەی کردووە، من لەگەڵ هەر کتێبێکدا، هەستدەکەم بەشێکی

مـن لەجیهانـی نـاو کتێبەکـەدا جێدەمێنێـت و بـۆ هەتـا هەتایە لەوێـدا دەژی. دەزانـی تـا ئێسـتاش بەشـێکی مـن لـە ژووری سـۆزانییەکانی دیستۆفسـکی و لای هێرمـان هیسـە و چوزانـم زۆریتردایـە. هەربۆیـە مـن ئەوکاتـە دەزانـم چێژی کتێبێکـم کـردووە، کـە بەشـێك لـە مـن، لـەوێ بەجێبمێنێـت. لـەم ڕۆژانـەدا ڕۆمانێکـی پاسـکال کینیـاری فەرەنسیم خوێنـدەوە بەنـاوی (هەمـوو سـپێدەکانی جیهـان)ەوە، کـە ڕووداوەکانـی لـە ١٦٥٠دا ڕوودەدەن و لەبـارەی دو سـانت کۆلومبـی میوزیسـیان و ژەنیارەوەیـە. ئـەو ڕۆمانـە کورتـە لەبارەی خۆشەویسـتییەکی سـەیرەوەیە و وا هەسـتدەکەم تـا ئێسـتاش مـن لـەوێ بـم و گـوێ لـە پارچـە میوزیکەکانـی دو سـانت بگـرم، کـە بـۆ تارمایـی ژنـە مردووەکەیـی دەژەنێـت، کـە هەمـوو ڕۆژێـك دێـت بـۆ سـەردانی. هـەر لەبـەر ئـەو خۆشەویسـتییەی بـۆ ژنەکـەی هەیەتـی و دەیەوێـت میوزیکـی بـۆ بژەنێـت، دەسـتبەرداری پـارە و ئاڵتوونـی پادشـا دەبێـت و نایەوێـت ببێتـە ژەنیـاری کۆشـك. بەلاتـەوە ئـەم خـوەی مـن، کارێکـی شـێتانە نییـە؟

مـن پێکەنیـم و وتـم: مـن ئـەو ڕۆمانـەم نەخوێندۆتـەوە و تەنهـا بـە فیلم بینیومـە، کـە وابزانـم پاسـکال خـۆی لەگـەڵ ئـالان کۆنـرۆی دەرهێنـەردا سـیناریۆی بـۆ نووسـیوە و فیلمێک ی جوانـە. دەزانـی مـن لـەو بـاوەڕەدام ڕۆمانـەکان هاوسـەنگی جیهـان ڕادەگـرن. ئەویـش بەسەرسـامییەکەوە وتـی: مەبەسـتت لـە هاوسـەنگی جیهـان چییـە؟ منیـش کەمێـك سـەرم لێنزیـك کـردەوە و درێـژەم پێـدا: گرفتـی مـرۆڤ ئەوەیـە بوونەوەرێکـی کامـڵ نییـە و ڕۆمانـەکان دەتوانـن یارمەتیمـان بـدەن تـا ئـەو ناکامڵییەمـان پـڕ بکەینەوە و هاوسـەنگی خۆمـان و جیهـان ڕابگریـن. تـۆ بیهێنـە پێـش چـاوت ئەگـەر زمـان، ڕۆمـان و هونـەری گێڕانـەوەی تێـدا نەبووایـە، چەنـد نوقسـان و سـامناك دەبـوو؟ مـن لـە منداڵیمدا زۆر سـەفەرم لەگـەڵ سـندیباددا دەکرد و بـە فەرشـەکەی ئـەو، دەچوومـە زۆر جوگرافیـا و شـوێنی سـەیرەوە. ئەگەرچـی ئەوسـا نەمدەزانـی و سـاڵانێکی زۆری ویسـت تـا لـەوە تێبگـەم،

کە سندیباد دەیتوانی قەرەبووی خەونی فڕین و دەربازبوون لە هێزی کێشکردنمان بۆ بکاتەوە، بەوپێیەی ئێمە بوونەوەرانێکی بێباڵین لەگەڵیدا دەستمکرد بە پێکەنین. بەڵام ماریا وتی: دەشێ فرانکشتاین و فاوست و زۆریتر نوقسانیمان پڕ بکەنەوە، یاخود بەرجەستەی خەونێکمان بکەن، ئیدی شەڕانگێز بێت یا نا. بەڵام دەبێت ژیانمان لەگەڵ ئەراندیرای هەرزەکاری ڕۆمانەکەی مارکیزدا، کە تەنکی لەپێناو پارەدا بە گانی دەدات و سەرباز و دەستگێڕ و کرێکار یەک لەدوای یەک سەرەی بۆ دەگرن تا لەگەڵیدا بنوون و ئەویش زۆرجار لەتاو ئازار دەگری و دەپاڕێتەوە، کە ئیدی بەرگە ناگرێت، پارسەنگی چ خەونێکمان بۆ دەداتەوە؟ خەونی لەشفرۆشی؟ وای وت و بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بکات، بەدەم بزەوە هەستا و بەرەو دەرەوە ڕۆیشت. ئەگەرچی من ویستم درێژەی پێ بدەم و بۆی ڕوونبکەمەوە، مەبەستم لە پڕکردنەوەی ناکامڵی و نوقسانی، تەنها بەرجەستەکردنی خەون و خەیاڵەکانمان نییە، بەڵکوو هونەری گێڕانەوە کۆمەکمان دەکات تا ژیان و مرۆڤ قووڵتر و فرە ماناتر ببینین. بەڵام لێگەڕام بۆ کاتێکیتر لەو بارەیەوە لەگەڵیدا بدوێم.

ماریا بۆ جگەرەکێشان دەچووە دەرەوە و لەبەردەم قاوەخانەکەدا بە نائارامی و سەیرکردنی ڕێبوارانەوە، زوو زوو نەفەسی لە جگەرەکەی دەدا. بەڵام ئەمجارە، ئاوڕی دایەوە و بە بزەیەکەوە، کە زیاتر غەمباریی تێدابوو، سەیریکردم. کاتێک هاتەوە ژوورەوە، بە شپرزەییەوە پرسیاری ئەوەی لێکردم ئەمڕۆ لە کتێبفرۆشییەکە چ کتێبێکم کڕیوە؟ منیش بەهێمنی پێموت دەزانی من مەبەستم ئەوە نەبوو، کە هونەری گێڕانەوە تەنها توانای بەرجەستەکردنی خەون و خولیاکانمانی هەیە، بەڵکوو دەمویست بڵێم ئەوەی مرۆڤی دروستکرد، گێڕانەوە بوو. مێژووی مرۆڤیش لەو ساتەوە دەستپێدەکات، کە توانی بەسەرهاتێک بگێڕێتەوە و

ئیدی لە جیهانی ئاژەڵان دابڕا. هەستمکرد پێویست ناکات زیاتر لەو بارەیەوە بدوێم، بەتایبەت کەماریام وا بینی خەیاڵی لە شوێنێکیتر بێت. هەربۆیە دەستم برد و کتێبەکەم بۆ درێژکرد، لەگەڵیدا نازانم بۆ وتم: لەوە دەچێت کتێبێکی سەیر بێت. بەتایبەت ناونیشانەکەی زۆر سەرنجڕاکێشە «چەتەکانی خەیاڵ - ڕێبەری کتێبنووسە نەناسراوەکان». لەگەڵیدا درێژەم پێدا و وتم: ئەگەر ئارەزوو دەکەیت، ئەوا دەتوانیت بیخوێنیتەوە، چوونکە دڵنیام ئەگەر تۆ چێژی لێببینیت، ئەوا بەلای منیشەوە کتێبێکی سەرنجڕاکێش دەبێت. لەگەڵ وتنی ئەم ڕستەیەدا پەشیمان بوومەوە، بەوەی لە موجامەلەیەکی هەرزەکارانەی دەکرد. بەڵام من زیاتر مەبەستم لەوە بوو، پێی بڵێم زەوقی خوێندنەوەمان لە یەکەوە نزیکن. بەڵام زۆرجار جیاوازی هەیە لەنێوان ئەوەی دەیڵێین، لەگەڵ ئەوەی مەبەستمانە بیڵێین. هەربۆیە بەناچاری درێژەم پێدا و وتم: تۆ دەزانیت ئارەزوی ئێمە بۆ کتێبەکان، لەیەکەوە نزیکن. ئەویش بەدەم سەیرکردنی کتێبەکە و هەڵدانەوەی لاپەڕەکانییەوە وتی: نا، کتێبەکە زۆر گەورە نییە و حەزدەکەم ڕۆژێك بەیەکەوە بیخوێنینەوە... لەوانەیە ئەوەش ئەزمونێکی خۆش بێت، ڕۆژێك دوو کەس لە کەنار دەریا، یاخود لەناو باخچەیەکدا بەیەکەوە کتێبێك بخوێننەوە. لەگەڵیدا سەری هەڵبڕی و بە هێمنییەوە پرسی: تۆ دەڵێی چی؟ ئەگەرچی ئەو پێشنیازە لەناکاو و سەیر بوو، بەڵام بێ دوودڵی ڕازیبووم.

دوای ئەوە ڕێککەوتین ڕۆژی شەممە، ئەگەر ئاووهەوا خۆش بوو، ئەوا لە کەنار دەریا کتێبەکە بخوێنینەوە.

***

دەریا بەخۆی و هێمنییە کپەکەیەوە، یاخود شەپۆلە سەرشێتەکانییەوە، زۆر بە بیابان دەکات و هەردووکیشیان بە کتێبێکی گەورە دەکەن.

دەشێ ئەمەش نهێنی ئەو هەستی ناکۆتاییە بێت، کە لە پشتیانەوە وەستاوە. کاتێك لەمبارەیەوە لەگەڵ ماریا قسەم کرد و پێموت: بڵێی ئەم هەستی ناکۆتابوونە، هۆکاری ئەوە نەبێت کە زۆربەی پێغەمبەرەکان یا خەڵکی بیابانبوون، یاخود بۆ ماوەیەك بیابان نشین بوون. ماریا وەك ئەوەی پێشتر بیری لە شتێکی وا نەکردبێتەوە، بەسەرسامییەوە سەیری کردم و شانێکی هەڵتەکاند. منیش هەر بۆ خۆشی درێژەم پێدا و وتم: لە کۆندا کەنارەکانی دەریای سپی، فەیلەسوفی بەرهەم دەهێنا، بەڵام بیابان پێغەمبەرەکان. ماریا پێکەنی و بەگاڵتەوە وتی: ئەم وڵاتە پڕ بەفر و دارستانەی ئێمەش، کڵاو و دەستکێشی بەرهەم هێناوە. بەدوای قسەکەیدا، هەردووکمان دامانە قاقای پێکەنین.

ئەو ڕۆژە ماریا لە کەنار دەریا، گەشتر و ئارامتر دەینواند. کاتێکیش ئەو کەشتییە گەورانەی بەرەو وڵاتانی فینلاند، تالینك و زۆر شوێن و دوورگەیتری دونیا بە بەردەممانـدا تێدەپەڕین و لە سەربانەکانیانەوە گەشتیار و موسافیرەکانیانمان زۆر بچووك دەبینی و دەمانبینین خۆیان داوە بەسەر ئاسنی قەراغی کەشتییەکەدا و لەناو دەریاوە سەیری دیمەنی کەنار دەریا دەکەن و وێنەی دەگرن. ماریا تا تێپەڕبوونی ئەو کەشتییە زەبەلاحانە، لێیان ڕادەما. کاتێکیش لەسەرخۆ و ئارام دەڕۆیشت تا لە قەراغی ئاوەکە کەمێك بەتەنیا پیاسەبکات، من سەیری بەلەم و دەریا ئارامەکە و ئەوم دەکرد، کە با یاری بە قژ و جلە تەنکەکەی دەکرد. ئەویش بەقەراغ ئاوەکەدا دەڕۆیشت و لێدەگەڕا شەپۆلەکان خۆیان بدەن بە قاچیدا، یاخود لەسەر بەردە لووسەکان دەوەستا و سەیری ئەوبەری کەنارەکەی دەکرد. پێدەچوو خۆشی سەرسام بێت بەو ئارامییەی ئەو ڕۆژە تێیدا دەژیا. لای من لەنێوان ئارامی و هەستکردن بە جوانی، پەیوەندییەکی شاراوە هەیە و هەموو بەرکەوتنێکم لەگەڵ جوانی، بەجۆرێك ڕووبەڕووبوونەوەمە لەگەڵ ئارامیدا. دەشێ ئەمەش نهێنی

چێژوەرنەگرتنی من بێت لە میوزیکی دەنگ بەرز و پڕ هەراو زەنا، یاخود ئەو تابلۆیانەی ڕەنگەکانیان زۆر خێرا و توند تێکەڵی یەکتر دەبن... چونکە هەستدەکەم ئەوانە ئارامیم پێنابەخشن.

دوای کورتە پیاسەیەك، ماریا گەڕایەوە لام و منیش هێشتا هەر لەسەر ئەو بەتانییە خۆڵەمێشییە ڕاکشابووم، کە ماریا لەگەڵ خۆیدا هێنابووی. جگەرەیەکی داگیرساند و بەدەم تێکردنی دوو کوپ قاوەوە، لەسەر لا ڕووە و من خۆی درێژکرد و وتی: دەتوانین دەست بە خوێندنەوەی کتێبەکە بکەین، با یەکەمجاریش لە تۆوە دەست پێبکەین.

ئەگەرچی پێموت: لەوانەیە هەڵە و بەجوانی گۆنەکردنی پیتە بزوێنەکانی ئەم زمانە قورس و سەیرە، چێژی گوێگرتنت بکوژێت. بەڵام ئەو وتی: دەتوانیت لەسەرخۆ بیخوێنیتەوە و من دەمەوێت چێژ لە دەنگت ببینم. ئەوەبوو من لەناو دەنگی بەرکەوتنی شەپۆلی دەریا بەکەنارەکە و زیقە زیقی باڵندەکانی دەورمان، دەستم بە خوێندنەوەی کتێبەکە کرد.

جارجار ماریا قژی لادەدا، باری پاڵکەوتن، یاخود دانیشتنەکەی دەگۆڕی و لەپشت چاویلکە ڕەشە گەورەکەیەوە دوور دەیڕوانی و بەئارامییەوە گوێی لە من دەگرت. منیش هەندێکجار لە وەستان و پشووە کورتەکانمدا، سەیری ئەو تاتۆیەم دەکرد، کە لەدەفەی شانیدا نەخشێنرابوو. تاتۆکە شەش ئەستێرەی قەبارە جیاواز بوو، کە قەبارەی هیچیان هێندەی ئەوانی دیکە نەدەبوو. لە ڕیزبوونە نارێکەکەشیانەوە وا بەدەردەکەوتن هەڵڕژابن یاخود کەوتبنە خوارەوە.

ئەو ڕۆژە تا ئێوارەیەکی درەنگ، کە خۆر کەمێك تینی تێدا دەمێنێت و وادەکات هێشتا شەوەکان ڕەنگیان شینێکی تەڵخ بێت، بە نۆرە ئەو ڕۆمانە بچووکەمان خوێندەوە و جارجاریش کەمێك پشوومان

دەدا، یاخود لەدوای تەواوبوونی بەشێك، ماریا چاوی دەنوقاند و لە فکرەوە دەچوو، یاخود کەمێك پیاسەی دەکرد و بە بێدەنگی دەگەڕایەوە لەشوێنێکی کتێبەکەدا، ماریا وتی: دەزانی هەرگیز لەوباوەڕەدا نەبووم ئەم ڕۆمانە ئەوەندە سەیربێت، چەندیش بیر لە ناوی (ڕۆلف فالك)ی نووسەرەکەی دەکەمەوە، نایەتە یادم پێشتر بینیبێتم یاخود ڕێکەوتنیم کردبێت. لەوەش سەیرتر ئەوەیە ئێمەی لەم کەنارەدا کۆکردەوە. دواتر لەگەڵمدا دەستی بە کۆکردنەوەی شتەکان کرد. منیش نەمدەزانی ئەم قسەیە، سەرەتایەك دەبێت بۆئەوەی دواتر من و ماریا پرسیار لە زیانی یەکتر بکەین و وەك کتێبێك خۆمان بۆ یەکتر بکەینەوە.

لەناو کزەی ئەو ئێوارەیەدا و بەدەم قسەکردنەوە، بڕیارماندا ماوەیەك بەناو دارستانەکەدا بڕۆین تا دەگەینە وێستگەی شەمەندەفەرەکە. لەوێدا زانیم ماریا منداڵییەکی پڕ لە تەنیایی بەسەر بردووە، بەوپێیەی هیچ برا و خوشکێکی نەبووە و ئەم لە تەمەنی پێنج سالیدا دەبێت، کاتێك دایکی بەجێیان دەهێڵێت و تا ئێستاش هیچ هەواڵێکی نازانێت، جگە لەوەی وەختی خۆی پێیانوتووە لە شارێکی بچووکی بەرازیل دەژی. ماریا هەر لە منداڵییەوە زۆر هۆگری باوکی بووە و وەك خۆی باسی کرد، لەو کچانە بووە بێ ئارامانە چاوەڕوانی گەڕانەوەی باوکییان دەکەن. بەلام پێش دوو ساڵ لەمەوبەر باوکی بەشێوەیەکی تەمومژاوی دەمرێت. کە لێمپرسی مەبەستی لە تەمومژاوی چییە؟ ئەو وتی: مردنەکەی وەك کارێکی خۆکوژی سەیرکرا، بەوەی ڕۆژێك دەچێت بۆ ڕاو و نێچی کە هێنایانەوە، فیشەکێك لەسەر دڵی درابوو. ئەگەرچی پێشتر هیچ ئاماژەیەك نەبوو بۆئەوەی ڕۆژێك خۆی بکوژێت، نەمانەت نەمنیهێشتبوو بزانم شێرپەنجەی هەیە و من لە ڕێگای یاداشتی ڕۆژانەکەیەوە زانیم.

•••

ئەگەرچی کات درەنگ بوو، بەڵام مریەم خەوی زڕابوو. دوای ئەوەی دەستنووسەکەی لە تەنیشتییەوە دانا، ماوەیەک لە جێگاکەیدا تەپاوتلی کرد و بیری لەوە دەکردەوە، چۆن شێرکۆ ئاوا بەئاسانی ڕۆیشت و خۆی ون کرد؟ بڵێی پێشتر بڕیاری جیابوونەوەی نەدابێت؟ دەکرێت کەسێک بێنەوەی یەک وشە بڵێت، ئەو چەند ساڵە فەرامۆش بکات و بڕوات؟

مریەم لە بیرکردنەوەکانیدا هەستی بە بوونی جۆرێک لە پەشیمانی دەکرد. بەڵام وەک زۆرجاریتر بە خۆی وتبوو، ئەم ڕقی لە شێرکۆ نییە و دەکرێت، لە خاڵێکدا ناکۆک بن، بەڵام ئەی ئەو هەموو شەو و ڕۆژەی بەیەکەوە بردویانەتە سەر؟ دەشێ شێرکۆ نیازی هەبووبێت لەگەڵ کەسێکیتردا بژی، بەڵام باوەڕیشی نەدەکرد ئاوا بێدەنگ بڕوات و هیچ دەنگی نەمێنێت. ئەو تەنها شتێک بەلایەوە گرنگ بووبێت، ئەم دەستنووسە بوو، کەچی نەک نەگەڕاوەتەوە تا بیبات، بەڵکوو هەر لێشی نەپرسیوەتەوە.

ڕۆژێک هەڵاڵە باسی ئەوەی بۆ کرد، کە لە دایکییەوە تەمێ بووە خەفەت بۆ هیچ پیاوێک نەخوات. چونکە باوکی لەسەروو ئەوەی ژنی بەسەرهێنا، بۆ ئافرەتیش هاتوچۆی بەغدای دەکرد. دایکیشی دەبوو لەناو کۆشێک منداڵ و خەفەتدا دابڕزێت. هەڵاڵە دەیوت ئەوان چۆن دەتوانن بەپێی میزاجیان ئافرەتەکان بگۆڕن، ئەمیش بەپێی ئارەزووەکانی دەیانگۆڕێت. ئەگەر پیاو حساب بۆ هەست و سۆزم نەکات، من بۆ بیریان لێبکەمەوە. جیاوازی ئێمە و ئەوان ئەوەیە کە ئەوان بەپێوە میزدەکەن و ئێمەش بە دانیشتنانەوە. مریەم دەیزانی هەڵاڵە ناحەقی نەبوو، بەوەی ڕێکەوتەکانی ژیانی وابوون، لەش و لارە سێکسییەکەی سەرنجی زۆر پیاوی ڕادەکێشا، بەڵام هەموویان تەنها لەشیان دەبینی. وەک خۆی دەیوت کەس برینەکانی ناوم نابینێت. هەموو هەر ئەوەیان لێت دەوێت، کە خۆیان دەیانەوێت. هەربۆیە خۆشەویستی هیچ نییە

جگە لە درۆیەک زیاتر. خۆرئاواش فێری کردم بۆ ڕابردوو نەژیم.

ئەگەرچی مریەم لە دۆخی هەلاَلە تێدەگەیشت، بەلاَم لەگەل ئەو ڕایەیدا نەبوو، کە هەمیشە خۆشەویستی و ڕابواردن یاخود کات بەسەربردنی تێکەڵ بەیەک دەکرد و ئەوەی بۆی گرنگ بوو، تەنها ئەوەبوو ساتەکانی خۆش تێپەڕن. خۆ مریەم ساتەکانی خۆش بوون لەگەڵ شێرکۆدا، ئەگەرچی وەک هەر دوو کەسێک کە پێکەوە دەژین، ئەمانیش هەندێک کێشەی بچووک لەنێوانیاندا هەبوو، بەلاَم هیچ شتێک لە ژیاندا تەنیا نییە، بەڵکوو هەر شتێک دژەکەشی لەگەڵدایە، وەک ژیان و مردن. هەربۆیە خۆشەویستیش بەشێک لە ئازار لەخۆیدا هەڵدەگرێت. وەهەمی ئێمەی مرۆڤ ئەوەیە تەنها خۆشەویستیی خۆی دەبینین.

ئەوشەوە مریەم نەیزانی کەی خەوی لێکەوتووە. بەلاَم بۆ بەیانی بیری مابوو، شەو بیری لە پەیوەندی نێوان خۆشەویستیی و ڕێکەوتەکانی ژیان کردبووەوە، هەرچۆن ئەو ڕۆژە باراناوییە لەنێوان ماریا و... بەخۆی وت لەنێوان ماریا و کێدا ڕوویداوە؟

***

# پێشنیوەڕۆی ١٤ای سێپتەمبەر

مریەم لە چوونە دەرەوە پەلەبوو، دەیویست هەندێک پێداویستی خواردن بکڕێت و زوو بگەڕێتەوە ماڵەوە. چونکە ماوەی پشووەکەی لە تەواوبووندا بوو، دەیویست کەمێک نەخشە و پلان بۆ کاتەکانی دابنێت. بەڵام کلیلەکەی بۆ نەدۆزرایەوە. جانتا و چەکمەجە و ناو قاپی سەر مێزی نانخواردنەکە گەڕا، بەڵام بێ سوود بوو. گەڕایەوە و دوای ئەوەی جانتاکەی شانی فڕێدایە سەر زەوی، چوو لەسەر قەنەفەکەی ژووری دانیشتن، پاڵیدایەوە. باشترین شتێک بیری لێکردەوە، ئەوەبوو واز لە چوونە دەرەوە بهێنێت و بچێت لەژێر دووشی حەمامەکە دابنیشێت. ئەو زۆرجار لەکاتی وەڕسیدا وای کردووە.

کە جلەکانی داکەند، ڕای گۆڕی و بانیۆکەی پڕ کرد لە ئاو و لەناویدا ڕاکشا. چاوی نوقاند و نەیویست بیر لە شێرکۆ بکاتەوە. سەرەتا بیری لەو چەند ڕۆژە پشووە کردەوە کە مابووی، دواتر هەندێک ڕووداوی ژیانی بە خێرایی هاتەوە یاد، ئەو کوڕە گەنجەی هەموو ڕۆژێک لە ڕێگای قوتابخانە لە سابونکەرانەوە دوای دەکەوت تا دەگەیشتە نزیک دوا ناوەندیی سلێمانی لە گەڕەکی سەرکارێز، ئەوجارەش ئاراسی پورزای وێرای لە دالانەکەی حەوشە بە خێرایی ماچی بکات، لەناکاو شەوبۆی هاوڕێی ئەو سەردەمەی بیرکەوتەوە، کە لەنێوان خۆیاندا نامەی دڵدارییان بەناوی کوڕانی جۆراوجۆرەوە بۆ یەکتر دەنووسی و دەیاندا

بەیەکتر. جارێکیان زۆر بەو نامەیە پێکەنین، کە مریەم بە خەیاڵی کوڕە میوەفرۆشێکەوە بۆ شەوبۆی نووسی و هەر شوێنێکی لەشی بە میوەیەک چوواندبوو. لە حەقی ئەوەش شەوبۆ نامەیەکی بەناوی شاگرد ئاسنگەرێکەوە بۆ دەنووسێت و تیایدا باسی ئەوەی بۆ کردبوو کەی بێت ئەڵقەڕێزی دڵی بۆ بکاتەوە و دڵی بە دڵییەوە لەحیم بکات. مریەم بزەیەکی بۆ کرد و هێواش هێواش خۆی نوقمی ئاوەکە کرد و ساتێک لەبنی بانیۆکەدا مایەوە. لەوکاتەدا بیری لە شەوبۆ دەکردەوە، کە دوای ئەو نامەیە پەیوەندییان بچڕا، چونکە شەوبۆ لەلایەن براکەیەوە نامەی میوەفرۆشەکەی پێ گیرابوو، کە لەسەری لێدانێکی باشی خورادبوو، ئیتر نەیانهێشتبوو هاوڕێیەتی مریەم بکات، دوای ئەوەی شەوبۆ زۆر سوێندی بۆ خواردبوون، کە مریەم بۆ گاڵتە ئەو نامەیەی بۆ نووسیوە.

کاتێک سەری لە ئاوەکە دەرهێنا، بەخۆی وت: شەوبۆ لەسەر ناوی ئەو کوڕە لێدانی خوارد کە نەبوو، تەنها لەسەر ناو لێدانی خوارد. دەڵێی ناوەکان بەڕاستی کەسانێکن و نایانبینین. شێرکۆش باس لە شتێکی وا ناکات؟ لەوێدا حەزی کرد زوو خۆی بشوات و بگەڕێتەوە لای ڕۆمانەکە.

هەر بە سەری نیوە تەڕەوە دانیشت و بێئەوەی بەخۆی بزانێت، دوو فەسڵی لە دەستنووسەکە خوێندەوە.

# دروستکردنی مێژوو
# تێکەڵبوونی سنووری واقیع بە کتێب

ئێمە لە کوێدا دەژین؟ ئەو ڕۆژە لە گەڕانەوەماندا، ماریا ئەم پرسیارە سەیرەی لێکردم، بەڵام چاوەڕوانی وەڵامی نەکرد و هەر خۆی پێیوتم دەزانی مرۆڤ وا هەستدەکات ئەو ماوە کەمەی لەژیاندا هەیەتی، هەمووی لەناو واقیعدا دەژی. بەڵام زۆرجار پرسیار لەخۆم دەکەم و دەڵێم: بلێی ئێمە هەموو ژیانمان لەناو واقیعدا بێت، یاخود بەشێکی لە دەرەوەی واقیعدا دەبەینەسەر؟ مەبەستی ئەو لە (دەرەوەی واقیع)، وەك بۆی ڕوونکردمەوە، ئەو ڕووبەرە دروستکراوە بوو، کە مرۆڤ لە ڕێگای گێڕانەوە و درۆوە دروستی دەکات و تێشیدا دەژی. بۆ نموونە کاتێك ئێمە بەدرۆ باسی سەفەرێك دەکەین بۆ کەسێك، کە نەمانکردووە، ئایا ئێمە بەجۆرێك لەناو ئەو ناواقیعەدا ناژین؟ ئایا کێ دەڵێت ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ناو مێژووش دروستکراوێکی وانین و ئێمە وەك حەقیقەت سەیریان ناکەین؟ هەربۆیە لەم بەشەدا دەمەوێت کورتەیەك لەبارەی ئەو ڕۆمانە بنووسمەوە، من و ماریا لەکەنار دەریادا خوێندمانەوە و هەستدەکەم سنووری واقیع و خەیاڵی تێکەڵکردووە، یاخود دەیەوێت مێژوویەك دروست بکات. ئەگەرچی دەشێ زۆر کەس کورتکردنەوەی کتێب، وەك کارێکی نەکردە و تەنانەت خیانەتکردن لە

**کتێبەکە ببینن، بەڵام نابێت ئەوەمان لەیاد بچێت، کە لە مێژوودا ئەو کتێبانە کەم نین، فەوتاون و ئێمە لە ڕێگای نووسینی کەسانیترەوە، زانیاریمان لەسەریان هەیە. ئەگەرچی ئەو کتێبانە فەوتاون، بەڵام ئێمە وێنایەکمان لەسەریان هەیە.**

ڕۆمانی «چەتەکانی خەیاڵ - ڕێبەری کتێبنووسە نەناسراوەکان»، کە من و ماریا لە کەناری دەریا و بەیەکەوە خوێندمانەوە، ڕۆمانێکی کورت بوو لەبارەی دەستەیەکی نهێنیی سێکەسییەوە، دوای ئەوەی نازییەکان لە دووەمین جەنگی خوێناوی و کاولکاریی جیهاندا، دەستەگرن بەسەر بەشێکی زۆری ئەوروپادا، لە ستۆکهۆڵم دروست دەبێت و کاریان نووسینی ڕۆمانە بەدزییەوە.

ئەم دەستە نهێنییە، کە هەرگیز خۆیان ئاشکرا ناکەن و نازانرێت کێ بوون، بەوەی ناوی وەهمی و نەناسراو لەسەر بەرگی کتێبەکانیان دەنووسن، یاخود جار هەبووە بێئەوەی هیچ ناوێك لەسەر بەرگی کتێبەکە دابنێن، چوون بەدزییەوە کتێبەکەیان لەسەر ڕەفەی یاخود لەنێوان کتێبەکانی کتێبفرۆشییەك بەجێهێشتووە. سەیر و سەمەرەیی کارەکەشیان ئەوە بووە، کە هەر کەسێکییان ڕۆمانێکی نووسیوە، دوای ئەوەی لەشێوە و قەبارەی کتێبدا ڕێکیخستووە و بەرگی بۆ دروستکردووە، ڕۆژێك بەدزییەوە لە گۆشەی ڕەفەی سێهەمی کتێبخانەیەکدا بەجێیهێشتووە. ئیتر وای لێدێت گۆشەی سێهەمی ڕەفەی هەر کتێبخانەیەك، دەبێتە شوێنی ئەو کتێبە نهێنییانەی بەدزییەوە نووسراون.

ئیدی شەڕ و ململانێی ئەو کتێبە نهێنییانە دەستپێدەکات و ئەو دەستەیەش بە تەنیا نامێنێتەوە، بەوەی کتێبنووسیتر پەیدادەبن و وای لێدێت ئەم خولیایە، پەلبهاوێت بۆ هەموو بابەتەکانیتری نووسین و تەنها

لەو ڕۆمانانەدا نەمێنێتەوە، کە لەوکاتەدا زیاتر بیرۆکەی سیاسی و دژ بە نازییەکان زاڵە بەسەریاندا، بەڵکوو نازییەکانیش گروپی هاوشێوەی ئەو دەستەیە دروستدەکەن و لە ڕێگایانەوە شەڕی (کتێبنووسە نەناسراوەکان) دەکەن. تەنانەت ئەم شەڕ و ململانێیەی نێوان کتێبنووسە نادیار و نەناسراوەکان پەلدەهاوێت بۆ شار و پایتەختەکانیتری دونیا. ئەمەش دەبێتە جێگای مەترسی و وەك لە ڕۆمانەکەدا و لە یەکێك لە ڕاپۆرتەکانی هەواڵگریی نازییەکاندا باسکراوە، داوای دامەزراندنی دەزگایەکی تایبەت دەکرێت، تا بتوانن لە ڕێگایەوە چاودێریی ئەو کتێبانە و نووسەرە نادیارەکانییان بکەن و بۆ خۆشیان دەستەیەکی نهێنیی هاوشێوەی ئەو نووسەرانە دروست بکەن، کە کاریان دژایەتی کردنی بیر و باوەڕی ئەو نووسەرە نادیارانە بێت. دیارە نازییەکان دەترسن لەوەی خەیاڵێك هەبێت لە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتی ئەواندا بێت. ئیدی شەڕێکی نادیدە و نادیار لەنێوان ئەو کتێبنووسانەدا دەستپێدەکات، کە زۆرجار ڕووبەڕووی کوشتنی تەمومژاوی دەبنەوە.

ڕۆمانەکە لەو ساتەوە دەستپێدەکات، کە شارەوانیی ستۆکهۆڵم بڕیاری ڕووخاندنی خانوویەکی کۆن دەدات لە یەکێك لە کۆڵانە باریکەکانی گەڕەکی گەملەستاند لە ناوجەرگەی شاردا. ئەو خانووە لەکاتی دووەمین جەنگی جیهانیدا، ماوەیەك دەستەیەکی نهێنیی نازییەکان لەم شارەدا بە دزییەوە تیایدا ژیاون و ئەو خانووەشیان وەك بارەگای هەواڵگری بەکارهێناوە. لەکاتی ڕووخاندنی خانوەکەدا، سنوقێکی پڕ لەکتێب و بەڵگەنامە لە ژورێکی بچووکی نهێنیدا دەدۆزرێتەوە، کە هەر لەدوای چۆلکردنییەوە لەلایەن نازییەکانەوە تا ئەوکاتە، هیچی لەبارەوە نەزانراوە. ئیدی لیژنەیەکی چوار کەسی دادەنرێت بۆ لێکۆڵینەوە لەو کتێب و کاغەز و بەڵگەنامانەی لەناو سندوقەکەدان و یەکێك لەو چوار کەسە، نووسەرێکی بەتەمەنە بەناوی (ئەندەرسۆن) و لەکاتی دووەمین جەنگی

جیهانیـدا، ئـەم وەك گەنجێـك لـە سـتۆکهۆلم خەریکـی ڕۆژنامەفرۆشـی بووە.

ڕۆمانەکـە، ئـەم نووسـەرە پیـرە دەیگێڕێتـەوە و بـە وردی و شـارەزاییەکی زۆرەوە باسـی ئـەو ماوەیـەی ژیانـی دەسـتە نهێنییەکـە و ڕیزبەندیـی کتێبـە نهێنییـەکان دەکات و کورتەیـەك لەبارەیانـەوە دەنووسـێت و بـە وردی بەڵگەنامـەکان دەپشـکنێت. چوونکـە (وەك دواتـر دەزانیـن) خـۆی یەکێـك بـووە لـەو سـێ کەسـەی دەسـتە نهێنییەکەیـان پێکهێنـاوە و تەنهـا کەسـی دەربازبـووی دەستەکەشـە، نەکوژرابێـت.

بـەڵام دوای تێپەڕینـی ئـەو هەمـوو سـاڵە و کاتێـك خەریکـی لێکۆڵینـەوە و پشـکنینی بەڵگـە و نووسـراوەکانی نـاو سـندوقەکەیە، ئـەو نووسـەرە پیـرە بـۆی ئاشـکرا دەبێـت، کـە دەزگای هەواڵگریـی نازییـەکان بـە وردی هەوڵی چاودێریکردنـی دەسـتەی نووسـەرە نەناسـراوەکانی داوە و بـەدوای کتێبـە نهێنییەکانیشـیاندا گـەڕاوە و ئاگاداریـان بـووە و ئەوەنـدەی توانیویەتـی، کۆیکردونەتـەوە.

ئەندەرسـۆن ئـەو بەڵگەنامانـەش دەبینێـت، لەبـارەی ئـەو نووسـەرانەوەن، دەزگا هەواڵگرییەکـە گومانـی لێکـردوون و بەوردی شـوێن پێـی هەڵگرتوون و تەنانـەت لـە ڕاپۆرتێکـدا نـاوی دوو کەسیشـی بـۆ ئاشـکرادەبێت، کـە نازییـەکان لـەو سـەردەمەدا گومانیـان لێکـردوون و کوشـتویانن و لەکاتـی خۆیـدا نەزانـراوە کـوژراون، بەوپێیـەی لـە ڕووداوی تەمومژاویـدا و بەجۆرێك کـوژراون، وەك مردنـی ئاسـایی بەدەرکەوتـوون.

ڕۆمانەکـە باسـی ئـەو مێـژووە فەرامۆشـکراوە دەکات، کـە کتێبـە نهێنییـەکان ڕووبـەڕووی نازییـەکان دەبنـەوە و چەندیـن ڕۆمانـی سـەیر و سەرنجڕاکێشیشـیان باسـدەکات، کـە دەسـت نازییـەکان کەوتـوون و لـەو سـندووقەدا پارێـزراون و ماریـا زۆر سەرسـام بـوو پێیـان. هەربۆیـە هەوڵـدەدەم ئەگـەر توانیـم، لـە کاتێکیتـردا باسـی چەنـد دانەیەکییـان بکـەم. چوونکـە ئـەم کتێبـەی مـن و ماریـا ئـەو ئێوارەیـە لـە کەنـاری دەریـا،

بەناوی (چەتەکانی خەیاڵ) خوێندمانەوە، خۆی یەکێك بوو لەو کتێبە نهێنییانە، وەك دواتر زانیمان و بەدوایدا گەڕاین.

ماریا، دوای ئەوەی لە ڕێگا داوەتم کرد تا لەماڵەوە نانی ئێوارە پێکەوە بخۆین، بڕیاریدا بێتەوە لام و وەك وتی بەیانی هیچ شتێکی وای نییە بیکات، هەربۆیە حەزناکات بەتەنیا بێت. ئەو شەوە تا درەنگانێك لەسەر قەنەفە چەرم ڕەشەکەی ژووری دانیشتن قاچی درێژکرد و بەدەم قاوە خواردنەوەوە، لەبارەی ڕۆمانی چەتەکانی خەیاڵەوە زۆر دوا و منیش سەرسامیی خۆم بەرانبەر ئەو ڕۆمانە نهێنییانە دەردەبڕی، کە لەکتێبەکەدا باسکرابوون، بەتایبەت ڕۆمانی (ڕێگایەکی تر بۆ مردن).

بە ماریام وت: نازانم بۆ هەستدەکەم ئەم کتێبە لەلایەن کەسێکەوە نووسرابێت، لە بنەچەدا خەڵکی ئەم وڵاتە نەبێت و لەوانەیە کەسێکی وەك من غەریبە بێت. ئەوەی ئەم گومانەشم لا دروستدەکات، دووریی ئەو خەون و خەیاڵەیە کە لە پشت نووسینی ئەم ڕۆمانەوە وەستاوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو خولیایەی لەپشت نووسین و گێڕانەوەی ڕۆمانی سویدییەوە هەیە، کە زیاتر گرنگی بەگێڕانەوەی شتی ژیانی ڕۆژانە دەدەن. تۆ هەست بەو جیاوازییە ناکەیت؟ ماریا بەسەرسامییەوە سەیری کردم و وتی: دەزانی من بیرم لە شتێکی وا نەکردبووەوە.

لەگەڵ سەیرکردنەکەیدا هەستم کرد کتێبەکە زۆر ڕۆژیتر کۆمان دەکاتەوە، بەڵام ئەوەی ئەندێشەم نەدەکرد، ئەوەبوو خۆمان ڕۆژێك ببینە یەکێك لە ئەندامانی ئەو دەستە نهێنییەی بەدزییەوە ڕۆمانیان دەنووسی و لە ڕەفەی سێیەمی کتێبخانەکان بەجێیان دەهێشتن، تا چیرۆکی ئەو کتێبنووسە نادیارانە تەواو نەبێت و فەرامۆش نەکرێن.

***

ئەو شەوە ماریا هەر لەسەر ئەو قەنەفەیەی ژووری دانیشتن،

وەك منداڵ نووست و بەیانی زوو بێئەوەی من ئاگاداربم، ڕۆیشتبوو. ئەگەرچی ئەو پێی وتبووم هیچ شتێکی وای نییە بیکات و ناشچێت بۆ سەرکار. ئیدی نزیکەی هەفتەیەك نەمبینییەوە و هیچ هەواڵێکیشیم نەزانی. لەو ماوەیەشدا دووجار زەنگم بۆ ئەو ژمارە تەلەفونە لێدا، کە ئەو پێیدابووم، بەڵام هەمیشە داخرابوو. لەو هەفتەیەدا حەزم کرد جارێکیتر و بەتەنیا، ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ) بخوێنمەوە. ئەوەبوو ئێوارەی ڕۆژی هەینی، کاتێك لە کار گەڕامەوە، دانیشتم و دەستم بە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە کرد.

***

# ڕۆمانی چەتەکانی خەیاڵ
# ڕێبەری کتێبنووسە نەناسراوەکان

ئەمڕۆ ڕۆژێکی سارد و تاریکی مانگی دیسەمبەرە و ستۆکهۆلم وەک ورچێکی سپی لە خەونێکی قوڵدایە. کاتێک بەئاگاهاتمەوە، وەک هەموو ڕۆژێکیتر لە ئەژنۆ و پشتمدا هەستم بەئازار کرد. بەهۆی کەم خەویشەوە، لەشم قورس و بێ حەوسەڵە بووم. هەربۆیە بەلەش گرانییەکەوە قاوەم دەمکرد و چووم لە پەنجەرەی موبەقەوە سەیری دەرەوە بکەم و کەمێک لە شەقامە چۆڵەکە ڕابمێنم. ئەگەرچی من چێژ لەو دیمەنە کپە نابینم. بەڵام ئەوە بووبووە خوو لەلام و نازانم بۆ هەمیشە وا هەستدەکەم بەیانییەک کە لە پەنجەرەکەوە دەڕوانم، دەبینم من لە شارێکیتردام، شارێکی نامۆ و سەیر.

هێشتا سەیری دەرەوەم دەکرد، کاتێک زەنگی تەلەفونەکە لێیدا و پاش وەڵامدانەوەم، دەنگێکی هێمن وتی: بەڕێز ئەندەرسۆن خۆشحاڵم باشبن و نەبمە مایەی بێزاریتان. من لە شارەوانی ستۆکهۆلمەوە تەلەفۆنتان بۆ دەکەم تا پێتان ڕابگەیەنم، بەڕێزتان دەستنیشان کراون بۆ کارێک پەیوەندی بە هەندێک بەڵگەنامە و کتێبەوە هەیە. منیش کە بەپێوە وەستابووم، لەبەر ئازاری قاچم، دانیشتم و پرسیم: چ بەڵگەنامە و کتێبێک؟ دەنگەکە بەهەمان هێمنییەوە وتی: لەکاتی کاری تێکدان و

نۆژەنکردنـەوەی یەکێك لـە خانووەکانـی گەڕەکـی گەملەستاند، سندوقێکی پـڕ لـە بەڵگەنامـە و کتێـب دۆزراوەتـەوە، کـە پێدەچێت بگەڕێتـەوە بۆ سـەردەمی جەنگـی جیهانیـی دووەم، واتـا ئەوکاتـەی ئێـوە لـە هەرەتـی گەنجیـدا بـوون. هەربۆیـە لیژنەیەکـی چـوار کەسـی دانـراوە تـا کاری ساغکردنەوە و ڕێکخسـتنییان بـۆ بکـەن و بەڕێزتـان یەکێکـن لـەو چـوار کەسـە.

پـاش نیـوەڕۆ، دوای ئـەوەی بـاش خـۆم پێچایـەوە تـا سـەرما دزە نەکاتـە لەشـمەوە، گۆچانەکـەم هەڵگـرت و بـەرەو بینـای شـارەوانی کەوتمـە ڕێ. لـەوێ ئافرەتێکـی باڵابـەرز هەمـان ئـەو قسـانەی لـە تەلەفوونەکـەدا پێموترابـوو، بەکەمێك وردەکارییـەوە بـۆ باسـکردمەوە. بەڵام مـن نیگەرانییەك وەك تـەم لەسـەر دڵـم نیشـتبوو، لـە پشـت چاویلکەکەمـەوە، چـاوم بڕیبـووە جێگایەکـی دوور. چوونکـە ئـەو سـندوقە وەك پێیانوتـم، دەگەڕایـەوە بـۆ ئـەو سـەردەمەی مـن وەك گەنجێـك بـەڕۆژ کاری ڕۆژنامەفرۆشـیم دەکـرد و شـەوانیش بەخوێندنـەوە و نووسـینەوە سـەرقاڵدەبووم، ئەگەرچـی تـا ئەوکاتـە هیـچ کتێبێکـم بڵاونەکردبـووەوە. مـن نیگـەران بـووم لـەوەی ئەمـە چ ڕێکەوتێکـە هاتۆتـە بەردەمـم و لـەم تەمەنـەدا مـن دەباتـەوە بـۆ ئـەو ڕۆژگارە تاریکانـەی زۆر ڕووداوی نهێنـی و تۆقێنـەر تێیـدا ڕوویـدا. پاشـان گەڕانـەوە بـۆ سـاڵانێکی وا، وەك هەڵدانـەوەی گۆڕێکـم دەبینـی، نـەوەك گـەڕان بێـت بـەدوای گەنجینەیەکـی شـاردراوە لـە دورگەیەکـی چەپەکـدا. بـەڵام مـن خۆمدایـە دەسـت ئـەو یارییـەی چارەنـووس لەگەڵمـدا دەیکات و وا ڕێککەوتین لە ڕۆژی دواترەوە دەست بەکاربکەم.

***

سـپێدەی ڕۆژی دواتـر، کاتێـك زەنگـی کاتژمێرەکـە لێیـدا، مـن بەخەبەربـووم. بەشـێکی زۆری شـەوەکەی تووشـی خەوزڕانـدن بووبـووم.

هەربۆیە لەکاتی دیاریکراودا گەیشتمە ئەو ژوورەی بۆمان دانرابوو. من سێ هاوکارەکەمم نەدەناسی و ئەوان پێش من لەوێ بوون. دوای ئەوەی دوو کرێکار سندوقەکەیان هێنا و بەئەسپایی لە ناوەڕاستی ژوورەکە دایاننا، یەکێکیان کلیلێکی گەورەی لەسەر سندوقەکە دانا و بێدەنگ ڕۆیشتنە دەرەوە.

سندوقەکە ڕەنگی قاوەییەکی تۆخ بوو، بە ئاسن نەخشی جۆراوجۆر و نووسینی لەسەر کێشرابوو، کە لە ناوەڕاستیدا خاچێکی شکاوە هەبوو. بۆ ماوەیەك ژوورەکە بێدەنگ بوو. سێ هاوکارەکەم سەیری منیان کرد و تێیانگەیاندم سندوقەکە بکەمەوە. ئەوەبوو دوای کردنەوە و هەڵدانەوەی سەری سندوقەکە، بینیمان کۆمەڵێك کاغەز و کتێبی تێدایە، کە بەشێوەیەکی جوان و بەپێی بەروارەکانیان ڕێکخرابوون. ئیدی کاری ئێمە دەستی پێکرد و دەبوو ئەو کاغەزانە بپشکنین تا بزانین چییان تێدا نووسراوە و لەبارەی چییەوەن.

دوای ئەوەی چاویلکەکەم لەچاوکرد، یەکەم کاغەزم هەڵگرت و پاش چاوخشاندنێك پێیدا وتم: ئەم کاغەزە بە ئەڵمانی نووسراوە. پاشان بڕیارماندا دوو مێزی گەورە لەیەك بدەین و کاغەزەکانی لەسەر هەڵبچنین و لەسەر مێزێکی بچووکیش کتێبەکان دابنێین، کە ژمارەیان بیست کتێب بوو. بۆ خۆشمان بەدەوری مێزەکاندا دانیشتین.

دوای ئەوە دەستمانکرد بە جیاکردنەوەی کاغەزەکان، ئەویش بەپێی ئەو زمانانەی پێیان نووسرابوون، کە ئەڵمانی، ئیسپانی، سویدی و دوو دانەشیان بە فەرەنسی بوون. ئەو ڕۆژە کارەکەمان وا دابەشکرد، کە هەر دوو کەسمان خەریکی پێداچونەوە و خوێندنەوەی بەشێکی ڕاپۆرتەکان بێت و سەرنجی خۆیان لەبارەیانەوە بنووسن. لە نیوەڕۆشدا هەرچوارمان کۆببینەوە و ڕای خۆمان لەبارەیانەوە بڵێین.

لەنیوەڕۆدا و پاش کۆبونەوەمان لەدەوری مێزێکی بچووك، هەر

چوارمـان کەمێك بێدەنـگ دانیشـتین، وەك ئـەوەی هەریەکێکمـان خـۆی بۆ قسـەکردن ئامـادە بـکات. دوای ئەوە و پـاش گۆڕینەوەی ڕا و سـەرنجەکانمان، گەیشـتینە ئـەو بـاوەڕەی ئـەو نووسـراوانە بگەڕێنـەوە بـۆ بەشـێکی تایبـەت لەنـاو پۆلیسـی نهێنیـی نازییـەکان (گێسـتاپۆ)، کـە لەگەرمـەی جەنگـی جیهانیـی دووەمـدا و لەناوەڕاسـتی ١٩٤٣ بـەدواوە، بەنهێنـی لـە سـتۆکهۆلمدا دەبـن و خەریکـی کارێکـی سـەیربوون، ئەویـش چاودێریکردنـی خەیاڵـە لە ئەورووپـادا. ئـەم چاودێریکردنـەش لەڕێـگای گـەڕان بـەدوای ئـەو کتێـب و نووسـراوانەوە بـووە، بـە نهێنـی بڵاوکراونەتـەوە، بێئـەوەی نووسـەرەکانیان دیـار یاخـود ناسـراوبووبن. بەرپرسـان و کارمەنـدە سـەرەکییەکانی ئـەو بەشـە نهێنییـەی گێسـتاپۆ، لـەدوای شکسـت و ڕوخانـی ڕایخـی سـێیەم لەکۆتایی جەنگەکـەدا و لەکاتـی هەڵهاتـن و خـۆ ونکردنیانـدا، نایانپەرژێتـە سـەر فەوتاندنـی ئـەو سـندوقە، وەك لەگـەڵ ڕاپـۆرت و نووسـراوەکانیتردا دەیکـەن. پاشـان ئـەو دەسـتەیە لەکاتـی هەڵهاتنیانـدا و لـە ٢٩ی یۆنیـۆی ١٩٤٥، لە gårdsjö لـە ڕووداوێکـی نادیـاری شـەمەندەفەردا هەموویـان تیادەچـن، وەك دواتـر بـۆم ئاشـکرا دەبێـت. ئەویـش کاتێـك بـەدوای زانیـاری لەبارەی ئـەو بەشـە نهێنییـەی گێسـتاپۆدا گـەڕام. ئیـدی ئـەم سـندوقە، نزیکـەی نیـو سـەدە لـەو ژوورە بچووکـەدا دەمێنێتـەوە، بێئـەوەی کـەس هیچـی لەبارەوە بزانێـت.

لەنـاو نووسـراوەکاندا، نووسـخەی دووەمـی ڕاپۆرتێـك هەبـوو، بەئەڵمانـی لـە ١٥ی نۆڤەمبـەری ١٩٤٣ نووسـرابوو. ئـەو ڕاپۆرتـە نێردرابـوو بـۆ بەرلیـن و تێیـدا بـاس لـە دۆزینـەوەی دەسـتەیەکی نهێنیتـری کتێبنووسـان کرابـوو، دوای بەرشـەلۆنە و پاریـس، کـە گێسـتاپۆ توانیبـووی بەیارمەتـی باوەڕپێکراوە سـویدییەکانیان بیدۆزێتـەوە. بـەڵام تـا بـەرواری نووسـینی ڕاپۆرتەکـە، نەتوانرابـوو شـوێن پێـی کتێبنووسـەکان هەڵبگـرن و بیاندۆزنـەوە. بەڵکوو تەنهـا توانرابـوو بوونـی دەسـتەیەکی وا ئاشـکرابکەن، کـە کاریـان نووسـین و

بڵاوکردنـەوەی کتێبێـك یاخـود ڕۆمانێکیـان بـووە بەدزییـەوە و دوور لـە چـاوی سانسـۆر. هـەر لـە ڕاپۆرتەکـەدا نـاوی ئـەو کتێبـە نووسـرابوو، کـە دەزگای هەواڵگریـی توانیبـووی بەرێکـەوت لـە یەکێـك لـە کتێبخانەکانـی سـتۆکهۆڵمدا بیدۆزێتـەوە، ئەویـش پـاش ئـەوەی کارمەندێکییـان لـە کتێبخانەیەکـدا دەیبینێـت و نـاوی نووسـەرەکەی سـەرنجی ڕادەکێشـێت، بـەوەی دوای گـەڕان و پشـکنین، دەردەکەوێـت نووسـەرێك نییـە بەنـاوی «یۆسـتان ئـۆك بێری»یـەوە و ڕۆمانەکـەش هیـچ نووسـخەیەکیتری نییـە. ئەمانـەش لەگـەڵ ناوەڕۆکـی ڕۆمانەکـەدا، گومانـی ئەوەیـان لا دروسـتدەکات، چالاکـی کتێبنووسـە نەناسـراوەکان، گەیشـتبێتە سـتۆکهۆڵمیش.

لەڕاپۆرتەکـەدا کورتەیـەك لەبـارەی ڕۆمانـی «ڕێگایەکیتـر بـۆ مـردن»ی یۆسـتان ئـۆك بێرییـەوە نووسـرابوو، ئەویـش بـەم شـێوەیە: ڕۆمانەکـە چاپێکی ناشـرین و پـڕ هەڵـەی هەیـە و پێناچێـت پیتـی چاپخانـە لـە چاپەکەیـدا بەکارهاتبێـت، بەڵکـوو زیاتـر بـە چاپـی دەسـت نووسـراوە و باس لـە کوڕێکی گەنجـی شـەرمن و بێدەنـگ دەکات لـە شـاری بەرلیـن، پیتچنـی ئـەو چاپخانەیەیـە، کـە ڕۆژنامـەی (دێـر شـتورمەر)ی نازییـە دەسـەڵاتدارەکانی لێچاپدەکرێـت و ڕۆژێـك بەهـۆی شـڵەژانییەوە، دوای ئـەوەی لەسـەر ڕێگای کارەکـەی، ئـەو کچـەی ماوەیەکـە لای خۆیـەوە و یەکلایەنـە خۆشـی دەوێـت، بەیانـی باشـی لێـدەکات، ئیـدی ئـەم بەدبەختـە بەڕادەیـەك دەشـڵەژێت و بارودۆخـی تێکدەچێـت، کـە ئـەو ڕۆژە لـە کاتـی کاردا تووشـی هەڵەیەکـی قـورس دەبێـت. بـەوەی لـە ڕێکخسـتن و پیتچنینـی لاپەڕەکانـی ڕۆژنامـەی (دێـر شـتورمەر) و لـە وتارێکـی هیتلـەردا، دوو هەڵـە دەکات. بـەوەی لـە دوو وشـەدا، شـوێنی دوو پیـت دەگۆڕدرێـت، کـە مانـای ناشـرین دەدەن و مانـای ڕسـتەکە تـەواو دەگـۆڕن. ئیـدی بـۆ ماوەیـەك لەلایـەن دەزگای گێسـتاپۆوە بـەوردی چاودێـری دەکرێـت و لێپێچینـەوەی لەگـەڵ دەکرێـت تـا بزانـن ئـەو هەڵەیـە چـۆن و بۆچـی ڕوویـداوە؟ دوای ماوەیـەك لێکۆڵـەری

دۆسییەکەی لە پۆلیسی نهێنی، بانگی دەکات و پێیدەڵێت: ئەگەر ئێمە بۆ چاودێریکردنی هەر گومان لێکراوێك فەرمانبەرێك دابنێین، ئەوا پێویستمان بە ژمارەیەکی خەیاڵیی لە کارمەند دەبێت تا فریای کارەکانمان بکەوین، هەربۆیە دەبێت لەمەودوا تۆ خۆت هەفتانە ڕاپۆرت لەسەر بیرکردنەوە و ئەندێشەکانی خۆت بنووسیت و بۆمان بهێنیت. باسی هەموو ئەو شتانەمان بۆ بکە، لەو ماوەیەدا دەیانکەیت و بیریان لێدەکەیتەوە، یاخود دێن بەخەیاڵتدا. ئیدی ڕۆمانەکە دەبێتە گێڕانەوەی بیرکردنەوە و ئەندێشە و خەونەکانی کوڕە گەنجەکە لە شێوەی چیرۆکدا و وەك ڕاپۆرت لەسەر خۆی دەنووسێت. بەڵام دوای ئەوەی کوڕە گەنجەکە خۆی دەکات بە دوو کەس، تا یەکێکیان بتوانێت ڕاپۆرت لەسەر ئەویتریان بنووسێت، سەرئەنجام یەکێك لە کەسایەتییەکانی ئەو کوڕە گەنجە دەمرێت، ئیدی کەسایەتییەکەیتریشیان بیر لە ڕێگایەکی مردن دەکاتەوە، تا بگاتەوە بە هاوەڵەکەی.

ئەو ڕۆژە، هەرچوارمان گەیشتینە ئەو باوەڕەی ئەو دەستە نهێنییەی سەر بە گێستاپۆ بووە و کاریان چاودێریکردن و گەڕان بووە بەدوای کتێبە نهێنییەکان و نووسەرە نەناسراو یاخود دەمامکدارەکانبانـدا، لەو بەروارەوە دەسپێدەکات، کە ڕۆمانی (ڕێگایەکیتر بۆ مردن)یان تێدا دۆزیوەتەوە. هەربۆیە دەبوو ئێمەش ڕاپۆرتەکانیتر لەسەر ئەو بەروارە ڕێکبخەین و ڕیزیان بکەین. لەوباوەڕەشدا بووین، کۆی ئەم کارانە نزیکەی پێنج ڕۆژی پێویست بێت، تا بتوانین لەوماوەیەدا ڕاپۆرتێکی ورد لەسەر ئەو بەڵگەنامە و نووسراوانە بنووسین، کە نزیکەی نیو سەدەیە لەناو ئەو سندوقەدا چاوەڕوانن.

ئەو ڕۆژە من زیاتر بێدەنگ بووم و گوێم لە گفتوگۆی سێ کەسەکەیتر دەگرت، چوونکە من نائارامانە گەڕابوومەوە ئەو ساڵانەی ڕاپۆرتەکانی تێدا نووسرابوون و وەك گەنجێك کاری ڕۆژنامەفرۆشیم

دەکـرد. لەنـاکاو لەبەرخۆمـەوە و وەك ورتـە ورتێـك وتـم: یۆسـتان ئـۆك بێـری بمایـە، ئـەوا ڕۆماننووسـێکی سـەیری لێدەردەچـوو. سـێ هاوکارەکـەم، کـە هەرسـێکییان لـە مـن گەنجتـر بـوون، بێدەنـگ بـوون و بەسەرسـامییەوە سـەیریان کـردم، تـا یەکێکیـان پرسـی: تـۆ ئـۆك بێرییـت دەناسـی؟ خـۆ بەپێـی ڕاپۆرتەکـە، ئـەو بوونـی نییـە! مـن بێدەنـگ بـووم و وا خـۆم نیشـاندا، وەك ئـەوەی گوێـم لێـی نەبووبێـت. بـەڵام دڵنیابـووم ئەگـەر ئـۆك بێـری زوو بـەو گەنجێتییـە نەکوژرایـە، پـاش ئـەوەی ڕۆژێکـی تەمتوومـان، لەسـەر شۆسـتەی شـەمەندەفەر دەکەوێـت و لەوکاتـەدا شـەمەندەفەر لێیـدەدات و دەمرێـت.

هـەر ئـەو ڕۆژە بڕیارمـدا بـەدەم کارەکەمەوە، بەسـەرهاتی ئەو کتێبنووسـە نەناسـراوانە بنووسـمەوە، کـە لەسـاڵانی دووەمیـن جەنگی جیهانییـدا، هاوڕێم بـوون و تەنهـا مـن توانیـم لـە کـوژران دەربازبـم.

❊❊❊

دوای خوێندنـەوەی ئـەو دوو فەسـڵە لـە ڕۆمانەکـە، مریەم کتوپڕ هەسـتا و چـوو نـاو کتێبخانـە و ئـەو چەکمەجانـە بـەدوای ڕۆمانـی (چەتەکانـی خەیاڵ) دا گـەڕا، کـە شـێرکۆ شـتەکانی خـۆی تیـادا هەڵدەگـرت. بەوردی نـاو کتێب و نێوان کتێبەکانیشـی پشـکنی، چاوی بـە کاغـەزە پەرشوبڵاوەکانیشـدا گێـڕا، جگـە لـە لاپەڕەیـەک کـە هەندێـک نـاوی کتێبخانـە و شـەقام و نـاوی چەنـد کەسـێک، کـە بەکورتـی چەنـد دێڕێـک لەبارەیانـەوە نووسـرابوو، هیچیتـری دەسـتنەکەوت.

دواتـر مریـەم لـە نهێنـی ئەم لاپەڕەیە تێدەگات و دەزانێت ئەم ناوانە کێن. دوای ئـەوەی کلیلەکـەی لـە بنـی گیرفانـی جانتـای شـانەکەیدا دۆزییـەوە، بـە نیـازی بازاڕکـردن چـووە دەرەوە و دەیویسـت بـەدەم ڕێگاشـەوە زەنـگ بـۆ چەنـد هاوڕێیەکـی شـێرکۆ لێبـدات و سـۆراخێکی شـێرکۆ بـکات، چونکـە

هەستی دەکرد ڕووداوی ناو دەستنووسەکە دەیترسێنێت، ئەگەرچی باش لە وردەکارییەکەی تێنەدەگەیشت و نەیدەزانی ئەمە یاداشتێکی ڕاستەقینەیە، یاخود بەسەرهاتێکی خەیاڵییە. بەڵام ئەو کاغەزەی دۆزییەوە و چەند ناوێکی تیادا نووسرابوو، هەندێکیانی لەو چەند فەسڵەدا بینیبوو، کە خوێندبوونییەوە و هەمووشیان کەسانێک بوون کوژرابوون. بەڵام مریەم لە چوونە دەرەوەکەیدا ڕێکەوتێکی سەیری بۆ پێشدێت، کە دواتر دەرگای ڕازێکیتر بە ڕوویدا دەکاتەوە.

***

# شەوی ١٤ی سێپتەمبەر

مریەم درەنگ گەڕایەوە ماڵەوە، ئەگەرچی لەم مانگەدا ڕۆژ زۆر درێژدەبێتەوە لە شاری ستۆکهۆڵم و خۆر تا درەنگانێک ئاوا نابێت و هەست بە بوونی ئێوارە ناکەیت، بەڵام مریەم ماندوو بوو، پێڕانەگەیشتبوو بازاڕیش بکات، چونکە کاتێک دوای نیوەڕۆ لەماڵ چووە دەرەوە، زەنگی بۆ دوو هاوڕێیان لێدا و بەدەم وردە قسە و گلەییەوە باسی شێرکۆی کردبوو، چونکە نەیدەویست ڕاستەوخۆ هەواڵی بپرسێت و بچێتە وردەکاریی ڕۆیشتن و دیار نەمانەکەیەوە. بەڵام لە قسەکانیانەوە دڵنیابوو ئەوان هیچ هەواڵێکی نازانن. کە دووەمین تەلەفوونی داخستەوە، لەناکاو کەسێک لە تەنیشتییەوە وتی بەیارمەتیت..

کاتێک مریەم ئاوڕ دەداتەوە، ڕادەچڵەکێت. بەوەی شێرکۆی لە تەنیشت خۆیەوە بینی. بەڵام هەرزوو پێش ئەوەی باوەشی پێدا بکات، هەڵوێستەیەکی کرد، کاتێک کەسەکە پێی وتبوو بێزەحمەت گوێم لە دەنگت بوو بە کوردی قسە دەکەیت، ویستم پرسیارێکت لێبکەم. چونکە من نەشارەزام لەم شارەدا. مریەم چەند ساتێکی ویست تا هاتەوە سەرخۆی و دڵنیابوو ئەو کەسەی لەبەردەمیدا وەستاوە، شێرکۆ نییە. ئەگەرچی زۆر شێوەی بەو دەکات. مریەم هەر زوو تێدەگات ئەو کەسەی زۆر بە شێرکۆ دەکات، لە شارێکی باکووری سوید دەژی و کێشەی پاسپۆرتی هەیە لە کونسوڵخانەی عێراقی، بەوەی گرفت لە ناوەکەیدایەو ناتوانێت

پاسپۆرت دەربهێنێت. دوای ئەوەی چەند جارێکیش بە تەلەفوون و نامە لەگەڵیاندا خەریک بووە، ئەنجامی نەبووە، ناچار بڕیاریداوە خۆی بێت و بچێتە لایان. بەپێکەنینەوە بە مریەمی وتبوو خۆت دەزانیت ئێمەی کورد هەموومان بەجۆرێک کێشەی ناومان هەیە. ئەو کەسە غەریبە، کە دواتر بە شێرزاد خۆی بە مریەم ناساندبوو، پرسیاری ئەدرەسی ماڵی هاوڕێیەکی کردبوو، بەوەی چۆن دەتوانێت بۆی بچێت، چونکە لە نیوەڕۆوە تەلەفوون بۆ هاوڕێکەی دەکات، بەڵام تەلەفوونەکەی داخراوە. شێرزاد هەر بەپێکەنینەوە وتبووی ئێمەی خەڵکی شارە بچووکەکان، دەڵێی نابینایین لەم شارە گەورەیەدا. بەڵام مریەم کەمتر سەرنجی لای قسەکانی بوو، خۆنەویستانە فەرمووی لێکرد بۆ خواردنەوەی قاوەیەک. مریەم شتێکی نەبوو بیکات، هەربۆیە تا ئەوکاتەی هاوڕێکەی شێرزاد تەلەفوونی کرد، لەسەر کورسییەکانی بەردەم کافیتریایەک دانیشتن و دوای ئەوەی بەناوێکیترەوە خۆی بە شێرزاد ناساند و وتی ناوم بەهارە، لەسەر پارچەیەک کاغەز بەوردی چۆنییەتی ڕۆیشتنی بۆ ئەدرەسەکە بۆ شێرزاد نووسی و پرسیاری ئەوەی لە شێرزاد کرد، خەریکی چییە. شێرزادیش بەدەم سەیرکردنی کاغەزەکەی لە مریەمی وەرگرت، وتی وەک پێموتیت ناوەکەم کێشەی تێدایە و کونسوڵخانەی عێراقیش پاسپۆرتم نادات. چونکە ناوی خۆمْ نییە. مریەم بە هێمنییەوە وتی نا مەبەستم ئەوە بوو بەگشتی چی دەکەیت؟ شێرازد پێکەنی و وتی ئەها... ڕۆژانە بەدەم چاوەڕوانیی ئێوارەوە، کاتەکانم لە ئیشکردن لە خانەیەکی پیران بەڕێ دەکەم. مریەم بەسەرسامییەوە پرسی: بۆ بەدەم چاوەڕوانیی ئێوارەوە؟ شێرزاد پاڵی دایەوە و خۆی لە تیشکی خۆرەکە دوور خستەوە د وتی لەبەرئەوەی من دوو کەسم، بە ڕۆژ ئەو بەشەم دەژی کە وەک هەر کەسێکیتر مرۆڤە، لە ئێوارەشەوە بەشەکەیترم دەست بە ژیان دەکات، کە نووسەرە. شێرزاد قاقایەکی لێدا و وتی هیوادارم نەترسابێت لەوەی

دەڵێم درو کەسم. مریەمیش وتی نا... بەڵام حەزدەکەم بزانم ئێستا لەگەڵ کامیاندا دانیشتووم؟ شێرزاد بە شۆخییەوە سەیری کاتژمێرەکەی کرد و وتی ئەمڕۆ لە پشوودام و بەشە نووسەرەکەم دەڵێ، چونکە ئەویترم ئارەزووی لە سەفەر نییە.

پێش جیابوونەوە، شێرزاد ژمارە تەلەفوونەکەی خۆی بە مریەم دا و مریەمیش حەزی دەکرد لێی بپرسێت تۆ ناوت شێرزاد نییە، بەڵام بیری کردەوە خۆشی ناوی بەهار نییە و هەر کەسێک لە ساتێکدا پێویستی بەم یارییە هەیە تا لە پشت ناوێکەوە خۆی بشارێتەوە. بەڵام لەو ساتەدا نەیدەزانی ئەوەی دەژی، ناوەکانە نەوەک مرۆڤەکان. کاتێک گەڕایەوەماڵەوە، بیری لەوە دەکردەوە ئەمڕۆ هەستێکی جیاوازی هەبوو، کاتێک وەک بەهار لەگەڵ شێرزاددا دانیشتبوو، بەلایەوە سەیر بوو، کاتێک وەک بەهار خۆی ناساند بە شێرزاد، شتێک لە ناوەوەیدا گۆڕابوو.

ئارەزووی لە نان خواردن نەبوو، خۆی گۆڕی و چوو بەلای خوێندنەوەی دەستنووسەکەی شێرکۆوە.

# تارمایی بکوژەکە
# ترسیش یەکێکە لە هونەرەکان

پەیوەنـدی نێـوان مـرۆڤ و تـرس، پەیوەندییەکـی قـوڵ و کۆنـە. مـن لـەو بـاوەڕەدام چەنـدە سەرکەشـی و بوێـری لـە پشـت دروسـتبوونی مرۆڤـەوە وەسـتاوە، ئەوەنـدەش تـرس ڕۆڵـی لـە مێـژوودا گێـڕاوە. بـۆ نموونـە دەشـێت تـرس لـە بـەردەم ڕووبارێکـدا، هـۆکاری دۆزینـەوەی بەلـەم بووبێـت، نـەوەك ریسـك کـردن لـە خۆدانـە دەسـت خوڕیـی ئاوێـك. بـەڵام جۆرێـك تـرس هەیە کـە هەمـوو بوونەوەرێـك هەسـتی پێـدەکات و پەیوەنـدی بـە داهێنانـەوە نییـە، ئەوەنـدەی پەیوەنـدی بـە مـردن و تیاچوونـەوە هەیـە و ئەمـەش خاڵـی هاوبەشـی نێـوان بوونەوەرەکانـە. بڵێـی چ ترسـێك لەپشـت ئـەو خولیایـەوە وەسـتابێت، کـە کتێبنووسـە نەناسـراوەکان هەیانبـووە، بـەوەی کتێبیـان بەدزییـەوە نووسـیبێت و هەربەدزیشـەوە لـە ڕەفـەی کتێبخانەیەکدا جێیـان هێشـتبێت؟ ئایـا تەنهـا لـە ترسـی سـتەم و سـەرکووتکردن، خۆیـان شاردۆتەوە؟ دەشـێ لەکاتێکیـتردا بـۆ وەڵامـی ئـەم پرسـیارە بگەڕێـم. چونکە ئێسـتا مـن دەمەوێـت باسـی ئـەو گومـان و ترسـە بکـەم. کـە ڕۆژێـك ماریا بۆنـی کـرد، بـەوەی چـۆن لـە مـاوەی ئـەو هەفتەیـەی یەکترمـان نەبینـی، نهێنییەکـی سـاماناکی بـۆ ئاشـکرا دەبێت و وا دەکات سـنووری نێـوان واقیع و کتێبەکـەی لێتێکبچێـت و هەسـت بـە ترسـبکات و پێمبڵێـت: (چەتەکانی خەیـاڵ) ڕۆمـان نییـە، بەڵکـوو یاداشـتێکی ڕاسـتەقینەیە.

ئێوارەی شەممە هەوا زۆر خۆش بوو لەڕێگای ماڵەوە بووم و چاوەڕێی شەمەندەفەرم دەکرد، کاتێك زەنگی تەلەفوونەکەم لێیدا و لە ژمارەیەکی نەناسراوەوە دەنگی ماریام گوێ لێبوو. لەوکاتەدا چەند سەرخۆشێك بە هات و هاوار لەولامەوە وەستان و من ناچاربووم کەمێك دووربکەومەوە. لەدەنگی ماریادا هەستم بە پەشۆکان و نائارامی کرد. من ویستم کەمێك هێمنی بکەمەوە، بەوەی بزانم چی ڕوویداوە و ئەم هەفتەیە بۆ هیچ هەواڵێکی نەبووە؟ بەڵام ئەو خۆی لە وەڵامدانەوەم دەدزییەوە و چەند جارێك بێئارامانە داوای لێکردم هەر ئێستا لە وێستگەی (مارییە تۆریەت)ی میترۆ بمبینێت. ناچار بەرەو ئەو شوێنە گەڕامەوە، کە دەبوو ماریا لەوێ چاوەڕوانم بکات.

دوای نزیکەی بیست خولەك، گەیشتمە وێستگەی مارییە تۆریەت و بێئەوەی ماریا هیچ قسەم لەگەڵ بکات، لە پێشمەوە ڕۆیشت و سواری شەمەندەفەرێك بوو، بێئەوەی بۆی گرنگ بێت بەرەو کوێ دەڕوات. کە لە بەرانبەریدا وەستام، ئەوم زۆر پەشۆکاو بینی. داوام لێکرد لەسەر دوو کورسی چۆڵ دابنیشین، بەڵام ئەو وتی: نا... باشترە لێرەدا و لەنزیك دەرگاکەوە بوەستین، نەوەك لەپڕ دابەزین. ئەو قسانەی ماریا سەرسامی کردم و ئەویش سەری لێمنزیك کردەوە و یەکسەر دەستی بە قسەکرد و وتی: دەزانیت هەستدەکەم (چەتەکانی خەیاڵ) ڕۆمان نەبێت، بەڵکوو زۆر بە بیرەوەری دەکات. بەڵام بیرەوەریی کێ، ئەوە نازانم. ئەم بەیانییە بە کارێك ڕێمکەوتە کتێبخانەی شار، دوای تەواوبوونی کارەکەم، زۆر گەڕام بەدوای نووسەری ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ)دا و لە فەرمانبەرەکانیش پرسیارم کرد، بەڵام بێسوود هیچ زانیارییەکم دەستنەکەوت و نووسەرێك نەبوو بەو ناوەوە. لەوکاتەدا وا هات بە خەیاڵمدا بچم لە ئەرشیفی ڕۆژنامەکاندا بەدوای ڕووداوەکانی سەرەوەختی دووەمین جەنگی جیهانیدا

بکەرێم. ئەوەبوو لە ڕۆژنامەی داگینز نیهێتەری مارسی ١٩٤٤دا، هەواڵی مردنی پۆستان لۆکبێرێم دۆزییەوە، ئەوەش توشی شۆکی کردم. لە هەواڵەکەدا باس لە کەسێك کرابوو، بەناوی ئۆکبێرییەوە و مامۆستای ناوەندی بووە، لەو بەروارەی لە ڕۆمانەکەدا نووسراوە، بە ڕووداوی شەمەندەفەر مردووە. بەوشێوەیە مردووە وەك لە ڕۆمانەکەدا بڵاوکراوە. لەوکاتەدا هەستم بەترس کرد. چونکە تێگەیشتم ئەمە ڕێکەوت نییە. ئەوەی زیاتر ترساندیشمی ئەوەبوو، یەکێك لە ڕاپۆرتە نهێنییەکانی ناو ڕۆمانەکە، ئەگەر بێتەوە یادت، باس لەوە دەکات، کە بەفەرمانی گێستاپۆ، ئۆکبێری بەدەستی گەنجێکی سکۆنەیی باوەڕپێکراوی خۆیان، بەشێوەیەك دەکوژرێت، کە هەرگیز نەبێتە جێگا گومان و وەك مردنێکی ئاسایی یاخود کاری خۆکوشتن سەیر بکرێت، ئەویش بە پاڵنانی بۆ ژێر پێچکەکانی شەمەندەفەرێك لە ڕۆژێکی تەمتوومانیدا. ئیدی ئەمە تووشی گومانی کردم و دوای ئەوە بەدوای چارەنووسی ئەکسلبێری هاوڕێی ئۆك بێریشدا گەڕام، کە لە ڕۆمانەکەدا بەهەمان شێوە باسی مردنی کراوە، دوای ئەوەی گێستاپۆ شوێن پێی هەڵدەگرێ و دەزانێت دوو ڕۆمانی بەنهێنی نووسیوە و لە کتێبخانەکاندا بەدزییەوە دایناون، بێئەوەی ناوی خۆیانی لەسەر بنووسێت.

من بێدەنگ و سەرسامانە سەیری ماریام دەکرد، کە تەواو خۆی لێمنزیك کردبووەوە، تا کەس گوێی لە دەنگی نەبێت. جارجار کەمێك دووردەکەوتەوە تا بواری تێپەڕینی ئەو ڕێبوارانە بدات، کە دەیانویست دابەزن، یاخود بەدوای جێگایەکی دانیشتندا دەگەڕان. ماریا چاوی تێبڕیم و وتی: تۆ دێتەوە یادت لە ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ)دا ناوی ئەکسلبێری لە ڕاپۆرتێکدا هاتبوو، کە دوو ڕۆمانی نووسیوە و بەپێی یەکێك لە ڕاپۆرتەکان، شەوێك سەرخۆشێك چەقۆیەك دەدات لەلا ملی و هەر ئەو شەوە دەمرێت. دەزانیت ئەو هەواڵەش لە ڕۆژنامەکانی

ئەوکاتـەدا بڵاوکراوەتـەوە و ئـەوان وایـان نووسـیوە، کـە ئەکسـلبێری لـە کۆلانێکـی سـۆدەرمالم بەدەسـتی سەرخۆشـێك دەکوژرێـت، بێئـەوەی دەستگیر بکرێت؟ ئەمانـە وایـان لێکـردم گومـان بکـەم، کـە ئـەو کتێبـەی خوێندمانـەوە و نـاوی (چەتەکانـی خەیـاڵ)ە، ڕۆمـان نییـە. بەڵکـوو نازانـم... هەسـتدەکەم یاداشـتێکی ڕاسـتەقینە بێـت.

منیش بە ساردییەکەوە وتم: یاداشتی کێیە؟

ماریـا تـەواو نائـارام بـوو، سـەری خسـتە سەرشـانم و هەناسـەی بـەر ملـم دەکـەوت و جارجـار دەیـوت نازانـم... نازانـم... بەسەرسـامییەوە وتـم: کەمێـك هێمـن بـەرەوە، لەوانەیـە ئەمـە تەنهـا ڕێکـەوت بێـت و هیچیتـر. پاشـان دەتوانیـن ئـەو کتێبـە فەرامـۆش بکەیـن، یاخـود بیفەوتێنیـن و لەبیـر خۆمانـی بەرینـەوە.

کتوپـڕ ماریـا سـەری هەڵبـڕی و وتـی: مـن باوەڕناکـەم ئەمـە ڕێکـەوت بێـت. ئەوکاتـە شـەمەندەفەرەکە لـە وێسـتگەیەك وەسـتا و خەڵکێکـی زۆر دابەزیـن و سـەرکەوتن، لـە نزیکـی داخسـتنەوەی دەرگاکـەدا بـوو، ماریـا بەشـێوەیەك دەسـتی گرتـم و ڕایکێشـام بـەرەو دەرەوە، کـە خەریـك بـوو ببـم بـە دەرگاکـەوە. هـاوارم کـرد: چـی ڕویـداوە وا هەڵسـوکەوت دەکەیـت. بـەڵام ئـەو وەڵامـی نەدامـەوە و بـەرەو دەرگای چوونـە دەرەوە ڕایکێشـام. کاتێـك بـە قادرمەکانـدا سـەردەکەوتین، ماریـا ئـاوڕی دایـەوە و وتـی: لـەوە دەچێـت تـۆ تێبینیـت نەکردبێـت؟ منیـش بـە پێکەنینـەوە وتـم ماریـا دەتەوێـت شـێتم بکەیـت، تێبینـی چیـم نەکـردووە؟ ئەویـش وتـی ئـەو پیـاوەی لـە گۆشـەکەی پشـتەوەت ڕۆژنامـەی دەخوێنـدەوە. منیـش قۆڵی ماریـام گرت و پێمـوت گوێبگـرە ڕۆژانـە بەهـەزاران کـەس لـە شـەمەندەفەرەکاندا ڕۆژنامـە دەخوێننـەوە، پاشـان ئـەوە چ پەیوەندییەکـی بـە ژیانـی منـەوە هەیـە؟

ماریـا کـە لەسـەر قادرمـە کارەباییەکـە ڕووبـەڕووم وەسـتابوو تـا چاودێریـی دواوە بـکات و دڵنیابێـت کـەس بەدوامانـەوە نییـە، وتـی بـۆ

منیش سەیرە، بەڵام باوەڕ دەکەیت ئەگەر پێتبڵێم ئەمڕۆ لە چەند شوێنێکدا ڕێکەوتی هەمان پیاوم کردووە و هەستم کردووە چاودێریم دەکات. لەهەمووی سەیرتر ئەوەیە کە یەکەمجار لە هۆڵی کتێبخانەکەدا هەستم پێکرد چاودێریم دەکات.

من بە پێکەنینەوە وتم: بەڵام من هیچ پەیوەندییەك لەنێوان ئەم خەیاڵانەی تۆ و کتێبێکدا نابینم، کە بەڕێکەوت کڕیومە. دەشێ ئێمە هەندێکجار شتەکان لەخۆمان ئاڵۆز بکەین. تۆش لەو باوەڕەدا نیت؟

ماریا لەسەرخۆ، وەك ئەوەی بیەوێت شڵەژان و نائارامییەکەی بشارێتەوە، یاخود بیەوێت هێمن بەدەربکەوێت، وتی: ئەوەی بۆتە جێگا بایەخم، ئەو لێکچوونە سەیرەیە لەنێوان ڕووداوی ڕۆمانەکە و واقیعدا هەیە. وەك دەزانیت بەپێی ڕۆمانەکە بێت، دەستەی کتێبنووسە نەناسراوەکان لە سەردەمی دووەمین جەنگی جیهانیدا و لە ستۆکهۆلم، سێ کەس بوون و چارەنووسی دوانیان لە ڕۆمانەکەدا ئاشکراکراوە، بەوەی لەلایەن گێستاپۆوە کوژراون. بەڵام ئەوەی جێگا پرسیارە بۆ من، ئەوەیە ئەی سێیەم کەسیان کێ بووە و چی بەسەرهاتووە؟ بڵێی ئەوەیان نەبێت ڕۆمانەکەی نووسیبێتەوە؟ ئەی بۆ ئەم کتێبە گەیشتە دەستی تۆ؟

***

ئەو شەوە ماریا لای من مایەوە و نەیوێرا بەتەنیا بێت. من ئەگەرچی باوەڕم بەم ڕێکەوتانە نەدەکرد، لەنێوان واقیع و ئەو کتێبە بچووکەدا هەبوو، بەڵام ئەو شەوە لەسەر داوای ماریا نووسخەیەکم لەبەر ڕۆمانەکە بۆ گرتەوە، بێئەوەی بزانین دواتر ئەم نووسخە لەبەرگیراوەیە دەبێتە هۆی کوشتنی ماریا، لە پارکێکدا.

ئەو شەوە، دوای ئەوەی چیرۆکی (کووچە خوێناوییەکان)م بۆ

ماریا گێڕایەوە، ماریا وەك جاری پێشوو، لەسەر قەنەفە چەرم ڕەشەکە نەنووست. بەڵکوو درەنگانێك لەدەرگای ژوورەکەمیدا و چاوەڕوانی وەڵام نەبوو، بەڵکو خۆی کرد بەژووردا. ئەو شەوە بۆ یەکەمجار هەستم کرد نووستن لەگەڵ ئافرەتێکی غەمگین، وەك فڕین وایە لە ڕۆژێکی تەمدا.

***

کاتێک مریەم ئەو دێڕەی خوێندەوە: نووستن لەگەڵ ئافرەتێکی غەمگین، وەک فڕین وایە لە ڕۆژێکی تەمدا، خۆنەویستانە لاپەڕەکەی دانا و بەرەو تەوالێتەکە ڕۆیشت، لەوکاتەی ویستی دەرگاکەی بکاتەوە، پەشیمان بوەوە و چوو لە مەتبەخ جگەرەیەک بکێشێت. هەستی بە تووڕەیی دەکرد، نیوەی جگەرەکەی مابوو، کە لە تەپڵەکێکدا پلیشاندییەوە و پەنجەرەکەی بە کراوەیی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ لای ڕۆمانەکە. بە لەشگرانییەکەوە خۆیدا بەسەر جێگە خەوەکەیدا و کەمێک لە بۆشایی ژوورەکە ڕاما و بیری لەوە دەکردەوە، چۆن لەم دۆخە دەربچێت و لەگەڵ جێهێشتنەکەی شێرکۆدا ڕابێت، یاخود فەرامۆشی بکات. لەوکاتەدا قسەیەکی شێرزادی بیرکەوتەوە، کە ئەمڕۆ لە وەڵامی ئەوەی چۆن لەو شارەی باکووری سوید گیرساوەتەوە، باسی ئەوەی بۆ کردبوو، کە جارێک بڕیاریداوە خۆی لە ڕابردووی خۆی بشارێتەوە، شارێکی دوور و چەپەکی هەڵبژاردووە و ناوی خۆشی گۆڕیوە تا جارێکیتر وەک کەسێکیتر، کەسێک بێ ڕابردوو لە دایک ببێتەوە. مریەم بە قووڵی لە سەختیی ئەو بڕیارەی شێرزاد تێدەگەیشت، بەتایبەت لەوکاتەدا بەناوی بەهارەوە گوێی لە شێرزاد گرتبوو. لەوکاتەدا ئەم خۆی نەبوو، بەڵکوو کەسێکیتر بوو ناوی بەهار بوو.

خۆی خستە سەر لاو دەستی بەخوێندنەوەی بەشێکیتری ڕۆمانەکە کرد.

# کووچە خوێناوییەکان
## چیرۆکی ئەوانەی لەسەر خوێندنەوە کوژران

ژیان وەك نووسین نییە، هەر کاتێکدا ویستمان، بتوانین چاکی بکەین و پاکنووسی بکەین. بەڵکوو زۆر شت لە ژیاندا تەنها یەکجار دەرفەتی ڕوودانی هەیە و گەڕانەوەی مەحاڵە. وەك ئەوەی ئێمە لەبەردەم کامێرایەکدا بین و هەردوای پەنجەپیانانیدا، ئیدی بۆ هەتا هەتایە وێنەکە بگیرێت و توانای گۆڕینیمان نەبێت. هەرچۆن ئۆدیب لە گوناهی ئەوەی لەگەڵ دایکیدا نووست و خواوەندەکانی تووڕەکرد، دەبوو چاوی خۆی دەربهێنێت و ژیان هیچ دەرفەتێکیتری نەدایە. ماریا ئەو شەوە لەبەردەم ترسێکی وادابوو، کە ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ) لەگەڵ خۆیدا بمانبات و چارەنووسمان بەرەو شوێنێك ببات، کە هەرگیز خەیاڵمان زەفەری پێنەبردبێت. هەربۆیە ئەو شەوە حەزمکرد بەسەرهاتی کووچە خوێناوییەکانی بۆ بگێڕمەوە تا ئارامی بکەمەوە و کەمێك لە خەیاڵەکانی دووری بخەمەوە. دەشێت ئەمەش یەکێك بێت لە سیحرەکانی هونەری گێڕانەوە.

ئەو شەوە ماریا غەمبارتر دەبینرا و هەندێکجار لە فکرەوە دەچوو. لەسەرخۆ داوای لێکردم گڵۆپەکان بکوژێنمەوە تا ماڵەکە تاریک بێت. منیش چەند مۆمێکم داگیرساند و دوای ئەوەی درزێکم خستە پەنجەرەی مەتبەخ، پێموت: دەتوانیت هەرلێرە جگەرە بکێشیت و پێویست ناکات بچیتە دەرەوە. بزەیەکی بۆ کردم و هەستا قاوەیەك دەمکات.

لەناو دەنگی تەقەی کوپ و کەوچکدا، گوێم لە ماریا بوو وتی: دەزانیت لێرە ئەم بێ دەربەستییەی مرۆڤ بۆ ڕابردوو ئازارم دەدات، بەوەی ئێمە مرۆڤەکانمان بێ ڕەگ قبووڵە و هیچ بۆمان گرنگ نییە ئەوانە لە چ ڕابردوویەکەوە هاتوون و کێن. ئایا سۆزانییەکیش هەروا نازێ؟ بەوەی بۆی گرنگ نییە بەرانبەرەکەی کێیە و لەگەڵیدا دەنوێت؟ لەلایەکیترەوە لە ڕابردووش دەترسم و نامەوێت ڕەگێك بۆ خۆم دروستبکەم و دامبکوتێت و بمکاتە زیندانیی، چونکە من دەمەوێت خۆم بم. ئەمەش دژ یەکییەکی ناخۆشە لە مندا. ماریا بەدەم پێکەنینەوە کۆتایی بە قسەکانی هێنا. لەوکاتەدا خەریکی ڕێکخستنی مێزی نانخواردن بووم و دەمویست شتێك بۆ خواردن ئامادەبکەم، کە خۆنەویستانە پرسیم: مەبەستت چییە؟ ئەویش بەدەم دانانی کوپی قاوەکەیەوە وتی: مەبەستم لە ژیانی ناو شەمەندەفەر و دەرەوەیەتی. من وای بۆ دەچم جۆرێك لە ژیان هەیە وەك ئەوە وایە ئێمە لە شەمەندەفەرێکدا بین و بەڕێکەوت یەکتر ببینین و یەکتر بناسین. لەوانەشە پێکەوە نان بخۆین و بشخەوین، بێئەوەی یەکتر بناسین و بزانین کێین. یاخود هەر بۆمان گرنگ نەبێت ڕابردووی یەکتر بزانین. دواتر هەریەکە و لە وێستگەیەك دادەبەزێت و لەوانەیە هەرگیز ڕێکەوتی یەکتر نەکەینەوە. ڕێشدەکەوێت دوای دابەزینمان بیرمان بکەوێتەوە، کە ناوی

یەکتریشمان نەزانیوە، چونکە بۆمان گرنگ نەبووە پرسیار لە یەکتر بکەین. لە شەمەندەفەرەکەدا مرۆڤ دەبێتە بوونەوەرێکی بێ ڕەگ و بێ سیما. مەبەستم لەوە نییە ئێمە بۆ ناسینی هەریەکێک پێویستمان بە زانینی بنەچەکەی هەبێت و مێژوویەکی دوور و درێژ لە پشتییەوە بخوێنینەوە، وەك ئەو ڕەگەی کەسانی دەرەوەی شەمەندەفەرەکە هەر لە خانەوادەی پادشا و بنەماڵەکان بۆ خۆیانی دروستدەکەن و دەیانەوێت بەو ڕەگ دروستکردنە، پیرۆزی و مەزنییەك بۆ خۆیان دروستبکەن. یاخود کەسانێکیتر، بێ ویستی خۆیان، بەر نەفرەت دەخات، وەك جولەکە و قەرەج و زۆریتر. بەڵکوو من مەبەستم لە سیما و مێژووی مرۆڤ خۆیەتی. گرفتەکە لای من ئەوەیە چ لە شەمەندفەرەکە، یاخود لە دەرەوەی بیت، هەردووکیان هەر بە ئازارن بۆ من. بۆ نموونە من نازانم تۆ کێیت و چی بوویت، هەرچۆن منیش نەزانراوێکم بۆ تۆ، کەچی ئەوەتا ئەم شەو بەتەنیا پێکەوەین. هەستدەکەم ئێمە دوو کەسی بێ سیما بین لەبەردەم یەکتردا و بێ سیمایی یەکتریشمان قبوولە. هەرچۆن لەو ئاهەنگانەدا ڕوودەدات، کە بەشداربووانی دەمامك دەپۆشن، تا خۆیان لەیەکتر بشارنەوە و ببنە نەناسراو. پێتوانییە پرسیاری ئەوەی تۆ کێیت؟ هێندەی ئەو پرسیارە گرنگ بێت کە دەڵێ من کێم؟

منیش بە پێکەنینەوە وتم: دەشێ تا ئەو ڕادەیە هاوڕات بم، کە لەسەر ئاستی ناسینی مرۆڤ وەك تاك قسە دەکەیت، ئەگینا ڕەگ و بنەچە، دەمانباتەوە سەر ڕەگەزپەرستییەکی نووستوو لەناوماندا و هەموو سنووردانانێکی وا لەگەڵ ئەویتردا، دان نەنانە بەویتردا. با بەسەرهاتی ئەو باڵەخانەیەت بۆ بگێڕمەوە، لە ئەستەنبول دەسووتێت، وەك جارێکیان لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندمەوە. یەکێك لەوانەی بەهانای گیرخوواردوانەوە دەچێت، دوای ئەوەی لەپێناو ڕزگارکردنی کەسێکدا ژیانی خۆی دەخاتە مەترسییەوە، کاتێك دەزانێت ڕزگاربووەکە کوردە، پەشیمان دەبێتەوە لە

کارەکەی و سەرزەنشتی خۆی دەکات. دەشێ ئێمە لە شەمەندەفەرەکەدا تورکێک، عەرەبێک، جولەکە و هیندییەکی سورمان قبوول بێت، بەڵام لەدەرەوەی شەمەندەفەرەکە... ماریا قسەکانی پێبڕیم و وتی: من مەبەستم لەوەیە زۆرجار ڕێکدەکەوێت کەسێك بناسین، بێئەوەی بزانین ئەو کێیە و لێیدەگەڕێین بەتێپەڕینی کات بیناسین.

منیش بە شۆخییەوە وتم: زۆرجار ناسینی پێشوەخت هیچ لە هاوکێشەکە ناگۆڕێت. بۆ نموونە لەو وڵاتانەی ئێمە، هەر دیکتاتۆر و ستەمکارێك، بەناوی دیموکراسییەوە قسەدەکات و ئێمەش دەیناسین. بەڵام ئەم ناسینە هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت و ژمارەی قوربانییان کەم ناکاتەوە. چونکە لەوانەیە ئەو خۆی نەناسێت و نەزانێت دیکتاتۆرە. دڵنیام تۆ ئەو ڕووداوە دەزانیت، کە بە (گرێی ستۆکهۆلم) ناسراوە و تێیدا چەند دزێك لە بانکێکدا کۆمەڵێك کەس بە بارمتە دەگرن، کەچی بارمتەکراوەکان عاشقی بارمتەکارانیان دەبن و پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوانیاندا دروستدەبێت، بێئەوەی پێشتر یەکترییان ناسیبێت. ئەگەر دەتەوێ بزانیت من کێم، ئەوا حەزدەکەم چیرۆکی (کووچە خوێناوییەکان)ت بۆ بگێڕمەوە. دوای ئەوە بەرانبەری دانیشتم و وتم: هەبوو نەبوو لە وڵاتێکی پڕ لە نەوتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کە دیکتاتۆرێك فەرمانڕەوایی دەکرد و بۆنی نەوتی لێدەهات، لەو وڵاتە شارێك هەیە ناوی سلێمانییە و لەو شارەدا دەستەیەك کتێبخوێنی نهێنی هەبوو. ئەو وڵاتە بەهۆی خەونە سامناکەکانی دیکتاتۆرەکەوە، هەموو شتێك تیایدا یاساغ دەکرێت و سیخوڕ و هەواڵگر وەك چاوی سەرۆك خۆی بن، بە وڵاتدا بڵاودەکرێنەوە و چاودێریی خشەی مار و مێروش دەکەن و مندالان دەکەن بە سیخوڕ بەسەر باوانیانەوە. هەموو شتێك یاساغ دەکرێت، کە سەرۆك حەزی لێیان نییە و دەبێت خەڵکی ئەو شتانەشیان خۆشبووێت، کە سەرۆك حەزی لێیەتی و ئەو

کتێبانـەش بخوێننـەوە، کـە سـەرۆك نووسـیوونی یاخـود حـەزی لێیانـە. ئـارەزووی شـێتانەی سـەرۆك، وڵات تووشـی شـەڕێکی وێرانکـەر دەکات لەگـەڵ دراوسـێکەیدا، کـە نـاوی ئێرانـە. نەهامەتـی ئـەو دەسـتە کتێبخوێنـە لەوکاتـەوە دەسـتپێدەکات، کـە بـە بڕیـاری سـەرۆك، زۆربـەی کتێبـەکان یاسـاغ دەکرێـن و بینینـی هـەر کتێبێکـی یاسـاغیش بەکەسـێك، حوکمەکەی کووشـتن دەبێـت. ئیـدی ئـەو دەسـتە کتێبخوێنـە ناچاردەبـن لەڕێـگای قاچاخچـی و کۆڵبەرەکانـی سـەر سـنوورەوە کتێـب پەیدابکـەن، کـە بەنـاو شـەڕگە و کوشـتارگای سـووپا شـەڕکەرەکاندا و بـە ڕێـگای پەنهـان و پڕ مەترسـیی نـاو چیـا و دۆڵەکانـدا دەڕۆیشـتن تـا کتێبییـان بـۆ بهێنـن. هەفتـەی شـەوێکیش بەدزییـەوە لـە ماڵـی یەکێکیـان کۆدەبوونـەوە، تـا لەبـارەی کتێبـەوە بدوێـن و شـیعر و چیرۆکـە دڵپەسـەندەکانیان بـۆ یەکتـر بخوێننـەوە. بـەڵام ئەمـان ناتوانـن تـا سـەر خۆیـان لـە چـاوی سـیخوڕەکان بشـارنەوە و لـە ڕێـگای شـوێنپێ هەڵگرتنـی قاچاخچییەکـەوە، دەدۆزرێنەوە و شـەوێك هەموویـان دەکوژرێـن. یەکێـك لـە دەسـتەی کتێبخوێنـە نهێنییەکە، کوڕێکـی مێرمنداڵـی تاقانـەی دەبێـت و بەدزییـەوە (بەومەرجـەی لای هیـچ کەسـێك باسـی نـەکات) باسـی ئـەو دەسـتە نهێنییـە و کۆبوونـەوەی شـەوانەی بـۆ دەکات، تـا ئەگـەر شـتێکی لەنـاکاوی بەسـەرهات، کوڕەکـەی نهێنییەکـە بزانێـت. ئـەوە دەبێـت دوایەمینجـار، کاتێـك بارێـك کتێبیـان بـۆ دێـت، باوکـی کـوڕە مێرمنداڵەکـە، بـۆ کۆبوونـەوەی دەسـتەکەیان دەڕوات، تا سـەیری ئـەو کتێبانـە بـکات، لـە ڕێـگای دوور و پڕ مەترسـییەوە گەیشـتوون. هـەردوای چەنـد مەترێـك دوورکەوتنـەوەی لـە ماڵـەوە، دەنگـی تەقـە دێت و کاتێـك کوڕەکـەی ڕادەکاتـە دەرەوە، تەرمـی باوکـی دەبینێـت بـەدەم گیـان دەرچوونـەوە چـاوی لـە تاریکییەکـە بڕیوە. کـوڕە مێرمنداڵەکە بـۆ ڕۆژی دواتر دەزانێـت، ئـەو شـەوە هەمـوو دەسـتەی کتێبخوێنـە نهێنییەکـە، کاتێـك بـە ڕێـگاوە بـوون بـۆ شـوێنی یەکتـر بینینەکـە، هەریەکـە و لەکووچـە یاخـود

کۆلانێکدا کوژراون. بەڵام ئەوکاتە کوڕە مێرمنداڵەکە نەیدەزانی دوای ساڵانێك و لەشەوێکی درەنگدا، ئەم چیرۆکەی باوکی لەبەردەم تۆدا دەگێڕێتەوە.

***

ئەوشەوە ماریا داوای کرد نووسخەیەك لەبەر ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ)ی بۆ بگرمەوە.

***

مریەم چاوی تەواو قورس بوو بوو، دەستنووسەکەی دانا و چاوی نوقاند. بیری لەو ڕۆژە دەکردەوە، بەدەم پیاسەی کەناری ئەو دەریاچەیەی دە خولەکێک لە ماڵیانەوە دوورە، شێرکۆ ئەم ڕووداوەی بۆ گێڕابووەوە. ڕووداوی کوشتنی باوکی و ئەو دەستە کتێبخوێنەی شەوێک هەموویان دەکوژرێن. مریەم لەوکاتەدا بیرۆکەیەک وەک بروسکە هات بە خەیاڵیدا، کە بەیانی دوای ئەوەی بەتەنیا خەریکی ئامادەکردنی نانی بەیانی دەبێت، بیری دەکەوێتەوە.

# سەرلەبەیانی ١٥ی سێپتەمبەر

مریەم ئەوکاتەی هێلکەیەکی شکاند و ویستی بیکاتە ناو تاوەکەوە، ئەو بیرۆکەیەی شەوی بیرکەوتەوە، کە بەدەم خەوەنوچکەوە ڕاگوزەر بە مێشکیدا هاتبوو، ئەویش سەبارەت بەوە بوو، شوێن پێی ڕووداو و ئەو کەسانە هەڵبگرێت، کە لە ڕۆمانەکەدا باسیان کراوە. چونکە ئەو بەسەرهاتەی باسی کوشتنی کتێبخوێنەکانی دەکرد، گومانی ئەوەی لا دروست کرد، ئەم ڕۆمانە یاداشت یاخود بیرەوەری شێرکۆ خۆی بێت و بەم شێوەیە نووسیبێتییەوە. بەڵام ئەگەر گومانێکی واش ڕێی تێبچێت، ئەوا نەیدەزانی لەکوێوە دەست بە گەڕان و پشکنین بکات. پاشان لە خۆی پرسی: دەبێت ئەم ڕۆمانە بۆ کێ نێردرابێت، وا سەرەتای هەر بەشێکی بەشێوەیەک نووسراوە، وەک ئەوەی لەگەڵ یەکێکدا بدوێت.

ئەو بەیانییە ڕووناکی هاوڕێی تەلەفوونی بۆ کرد و وەک هەمیشە بەدەم گاڵتە و پێکەنینەوە باسی ئەوەی بۆ کرد، کە کۆتایی هەفتە بەنیازە شەوێک لە ماڵی خۆیان کۆببنەوە و مریەمیشی بۆ ئەوە دەعوەت کرد. بەڵام مریەم بەهەر بیانوویەک بێت خۆی دزییەوە، ئەگەرچی نەیدەزانی لەو شەوە تا درەنگانێکی شەو، ئەم لەگەڵ شێرزاددا دەبێت و تا ڕازی دەستنووسی ڕۆمانەکە و خۆی و شێرکۆشی بۆ دەردەکەوێت. هەوڵیدا گفتوگۆکەی لەگەڵ ڕووناکدا زوو کۆتایی پێ بهێنێت، چونکە پەلەبوو بەشێکیتر لە ڕۆمانەکە بخوێنێتەوە.

## دەروازەی نهێنی
## ترسناکە نەزانیت لە خەوندایت یاخود واقیع

لە ڕاستیدا ئەگەر بەدەست خۆم بوایە، ئەوا لەم بەشەدا درێژەم بە گێڕانەوەی هەندێك وردەکاری و لایەنی شاراوەی بەسەرهاتی دەستەی کتێبخوێنە نهێنییەکان دەدا، کە شەوێك لە ترۆپکی دەسەڵاتی بەعسییەکاندا هەموویان دەکوژرێن. ئەویش نەك لەبەرئەوەی هەمیشە وا هەستدەکەم شتێك هەیە و نەمتوانیوە بیگێڕمەوە، بەڵکوو زیاتر لەبەرئەوەیە چارەنووسی من لەوکاتەوە دەگۆڕدرێت، کە باوکم کاتێك لە کۆڵانە تاریکەکەدا، لە خوێنی خۆیدا دەگەوزا، بەچپەوە پێڕاگەیشت پێمبڵێت: تا دەتوانیت ئەم وڵات و سەرزەمینە جێبهێڵە، کە جێگای کتێبی تیا نابێتەوە. من حەزم دەکرد باسی ئەو کتێبانە بکەم، کە باوکم گرنگیی بە خوێندنەوەیان دەدا و ئەو کتێبخانە نهێنییەش، کە لە خانوویەکی گڵی گەڕەکی سابوونکەراندا دروستیان کردبوو و ئێستا هیچ شوێنەوارێکی نەماوە و لە جێگایدا ئەپارتمانێکی گەورە دروست کراوە. من حەزم دەکرد باسی هەموو ئەو شتانە بکەم، چونکە ئەوە گێڕانەوەیە ناهێڵێت فەرامۆشیی زەفەرمان پێببەرێت. بەڵام ئەو ڕۆژەی ماریا نووسخەیەکی لەبەرگیراوەی ڕۆمانەکەی لەگەڵ خۆیدا برد، من ڕێگام کەوتە لای کتێبفرۆشییەکە و نهێنییەکی گەورەم بۆ ئاشکرا بوو.

ئـەو بەیانییـە، ماریـا زوو لەخـەو هەسـتا و بـەدەم خـۆ گۆڕینـەوە، پارووەیـەك نانـی خـوارد، بێئـەوەی بچێتـە بـەردەم ئاوێنـە و بـۆ ماوەیەكـی زۆر بوەسـتێت تـا خـۆی جـوان بـكات (وەك پێـی وتبـووم ئـەو حـەزی لـە وەسـتانی زۆری بـەر ئاوێنـە نییـە، چونكـە دەبێـت وەك كەسـێكیتر لـە خـۆی ڕابمێنێـت، ئەمـەش ناڕەحەتـی دەكات). ئـەو بەیانییـە ماریـا پەلـەی بـوو، چونكـە دەیویسـت فریـای كارەكـەی بكەوێـت، كـە لـە دووكانێكـی پۆشـاك فرۆشـی كاری دەكـرد. لەنـاو دەرگاكـەدا بـۆ جارێكیتـر سـەیری جانتاكـەی شـانی كـرد، وەك ئـەوەی بیەوێـت دڵنیابێـت نووسـخە لەبەرگیراوەكـەی ڕۆمانـی (چەتەكانـی خەیـاڵ)ی پێیـە. منیـش بـە پێكەنینـەوە وتـم: ئێسـتا تـۆ وەك پیـاز دەمبینیـت یاخـود كاهـوو؟ ماریـا پێكەنـی و بـەدەم چوونـە دەرەوەوە وتـی: هەنـار.

شـەو كاتێـك لەبـارەی ناسـینی ئەویتـر و مرۆڤـی نـاو شـەمەندەفەرەكەوە دەدوایـن، مـن بـە شـۆخییەوە باسـی جۆرەكانـی مرۆڤـم بـۆ ماریـا كـرد، لـە پەیوەنـدی ئێمـە پێیانـەوە. وتـم: جۆرێـك مـرۆڤ هـەن، هـەر بـە پیـاز، یاخود تەماتـە دەكـەن، هەرچەنـدە پـڕ ڕاز و نهێنـی خۆیـان بەدەربخـەن، بـەڵام چەنـد تـوێ تـوێ پاكیـان بكەیـن، كەچـی هـەر دەگەینـە توێیەكـی تـر لـە پیـاز یاخـود سـێو، بـەوەی هیـچ ڕاز و نهێنییـەك لـە پشـت توێكڵەكەیانـەوە نییـە. هەشـن وەك هەنـار یاخـود كیـوی وان و لـە پشـت توێكڵەكەیانـەوە شـتێكیتریان حەشـارداوە. بـە پێكەنینیشـەوە وتـم: مرۆڤیـش هەیـە بـە كاهـوو دەكات، بـەوەی دەر و نـاوی نییـە.

ماریا بـەم لێكچواندنـە زۆر پێكەنـی و بـەدەم پێكەنینیشـەوە نـاوی میوە و سەوزەی تری دەبرد و پرسیاری لێدەكردم، چ مرۆڤێك بەوانە دەكات؟

***

بڕیارم دابوو ئێوارە سەرێك لە کتێفرۆشییەکە بدەم، ئەگەرچی ماندووی ڕۆژێکی پڕ لەکار بووم، بەوپێیەی ماوەی چەند ساڵێك بوو بە ڕێکەوت لە کارگەیەکی دروستکردنی مۆم وەك کرێکار کارم دەستکەوتبوو. لەگەڵ کردنەوەی دەرگای کتێبفرۆشییەکەدا، بۆنی قاوە شاڵاوی بۆ هێنام و بەهۆی دەنگی ئەو زەنگۆڵە وردانەی بەسەرو دەرگاکەوە هەڵواسراون و لەگەڵ چوونە ژوورەوەدا دەلەرنەوە و دەنگێکی خۆش دەردەکەن، ولیەمی پیر سەری هەڵبڕی و بێئەوەی چاو لەسەرم لابەرێت، تا گەیشتمە بەردەمی هەر لێم ورد دەبووەوە. کاتێك سڵاوم لێ کرد، بەدەم وەڵامدانەوەوە دەفتەری کتێب فرۆشتنەکەی دەپشکنی، تا لەسەر لاپەڕەیەك وەستا و لێی پرسیم: چەند ڕۆژێکە چاوەڕوانتم تا دڵنیابم لەوەی تۆ کتێبێکت نەکڕیوە بەناوی (چەتەکانی خەیاڵ)ەوە؟ چونکە بەپێی وەسفی ئەو کوڕەی ئەو ڕۆژە لێرە بووە، گومانم کرد تۆ ئەو کتێبەت کڕی بێت. منیش بێئەوەی گرنگییەکی زۆر نیشان بدەم، بەسەر وەڵامم دایەوە و لەگەڵیدا پرسیم: هیچ هەڵەیەك هەیە؟ ئەویش بەپێکەنینەوە وتی: دەتوانیت کوپێك قاوە بێنیت و کەمێك لام دانیشیت.

دوایەمین کڕیاری ناو کتێبفرۆشییەکە، پیاوێکی باڵا بەرز بوو، بەدەم خوێندنەوەی ناونیشانی کتێبەکانەوە، بەرەو دەرەوە ڕۆیشت و کەمێك لەبەر دەرگاکە وەستا و سەیری ئەملا و ئەولای شەقامەکەی کرد و پاشان لەچاو ون بوو. دونیا وردە وردە تاریك دادەهات و کتیبفرۆشییەکەش چۆڵ بوو بوو. کاتێك لەبەرانبەر ولیەم دانیشتم، کە وەك خووی هەموو کتێبفرۆشییەکی دەستی دوو، بەدەوریدا کۆمەڵێك کتێبی زۆر لەسەر یەك هەڵچنرابوون، وتم: ئەگەر شتێك هەیە ئێستا دەتوانیت پێم بڵێیت. ئەویش کتێبەکەی ژێر دەستی داخستەوە و بەبزەیەکەوە، دوای ئەوەی چاویلکەکەی داگرت، وتی: دەکرێ بزانم ئەو کتێبەت بۆ کڕیوە؟ پرسیارەکەی ولیەم بەلامەوە سەیربوو، بە سەرسوڕمانەوە وتم: هەست

ناکەیت پرسیارێکی سەیر دەکەیت؟ پاشان تۆ کتێب دەفرۆشیت و هەر کڕیارێکیش ئازادە لەوەی چ کتێبێك دەخوێنێتەوە. با وای دابنێین ناونیشانەکەی سەرنجی ڕاکێشام و حەزم کردووە بیخوێنمەوە. بەڵام ئەو بەدەم سەر ڕاوەشاندنەوە وتی: ئەو شتانە دەزانم... منیش مەبەستمە بزانم بۆ بەتایبەت ئەو کتێبەت کڕیوە؟ ئەی خۆ کەسیتر ئەو کتێبەی نەبینیوە یاخود نەخوێندۆتەوە؟ نەمتوانی سەرسوڕمانی خۆم بشارمەوە، وتم: پرسیارێکی دیکەی سەیرتر، بەڵێ کەسێکیتریش خویندویەتییەوە. بەڵام بۆ دەپرسیت؟ ئایا هیچ شتێك هەیە لەبارەی ئەو کتێبەوە و بتەوێت پێم بڵێیت؟

ئەوکاتە ولیەم سیمای کەمێك گۆڕا و سەری لێم نزیك کردەوە و وتی: باخۆمان گێل نەکەین، چونکە هەردووکمان دەزانین لەبارەی چییەوە قسە دەکەین، ئەگەر نەشزانیت، ئەوا من ئێستا پێت دەڵێم کە ئەو کتێبە، کتێبێکی سەیر و ناوازەیە و بەهەڵە گەیشتۆتە دەست تۆ. دیارە هەڵەی تۆ نییە، بەڵام دەبێ لە نزیکترین کاتدا ئەو کتێبە بگێڕیتەوە. منیش ویستم دۆخێکی گاڵتەئامێز دروستبکەم، وتم: لەکاتی وادا مرۆڤ خۆنەویستانە دەبێتە بازرگان، بەوەی نرخی کاڵاکە بەرزدەکاتەوە، بەڵام من بیرم لەوە نەکردبووەوە ڕۆژێك ببمە بازرگانی کتێب. بەڵام ولیەم بە جدییەتی پێشووەوە وتی: قسە لەبارەی پارەوە نییە، چونکە ئەو کتێبە لەتوانایدا هەیە چارەنووسی ئەو خوێنەرانەی بگۆڕێت، کە بەهەڵە دەگاتە دەستییان، بەوەی ڕووبەڕووی مەترسییان بکاتەوە. هەستمکرد بێویستی خۆم لەسەر کورسییەکە پاڵمدایەوە و ڕەنگم گۆڕا، چونکە ترس و قسەکانی ماریام بیرکەوتەوە. پرسیم: لە مەبەستت تێناگەم. ئەویش وتی من دەزانم ساڵانێکە تۆ هاتوچۆی ئێرە دەکەیت و دەشزانم زۆر بەوردی کتێبەکان دەپشکنیت و سەیریان دەکەیت، دەبینم بەچاوێکی پڕ لە ئارامی و میهرەبانییەوە بەسەر کتێبەکاندا دەگەڕێیت، وەك ئەوەی

بترسیت بشکێن. بەپێی ئەزموونی خۆم دەزانم هەموو خوێنەرێك وانین. پاشان لە ئارەزووی تۆ بۆ ئەو کتێبە سەیرانەش دەگەم، کە بەوردی بەدوایاندا دەگەڕێیت. ئەمەش وا دەکات هیچ گومانم نەبێت لەوەی تۆ دەبوو یەکێك بیت لەو خوێنەرە دەگمەنانەی، ئەگەر بۆ جاریکیش بووە، لە نووسینێکی ئەلبەرتۆ مانگوێلی ئەرجەنتینیدا بیت، ئەوەی کتێبێکی گەورەی هەیە بەناوی «مێژوی خوێندنەوە»وە، نازانم ئەو کتێبەت خوێندۆتەوە یا نا؟ بەهەرحاڵ هەموو ئەمانە وادەکەن متمانەم بەوە هەبێت، کە ئەوە ڕێکەوت نییە ئەو کتێبە گەیشتبێتە دەست تۆ.

منیش بە پێکەنینێکی تاڵەوە وتم: خەریکە دەمترسێنیت. بەڵام ولیەمی پیر بەدەم هەستانەوە وتی: نا... من ڕاستیت پێدەڵێم و دەبێت هەوڵبدەیت ئەو کتێبە زوو بگێڕیتەوە بۆ جێگای خۆی. تۆ هیچ لەبارەی ڕۆلف فالکی نووسەری ڕۆمانەکەوە دەزانیت؟

منیش پێموت: هاوڕێکەم گەڕاوە بەدوای ئەو ناوە و کتێبەتری ئەو نووسەرەدا، بەڵام هیچ شتێکی لەبارەیەوە دەستنەکەوتووە، وەك ئەوەی کەسێکی وا بوونی نەبێت. ولیەمیش وتی: ئەمە ڕازەکەیە. چونکە کەسێك نییە ناوی ڕۆلف فالك بێت.

ئەو ڕۆژە ولیەمی کتێبفرۆش، دوای ئەوەی پەیمانی لێوەرگرتم بەزووترین کات ڕۆمانەکە بگێڕمەوە، پاشان لەبەر ئەو ئەگەرەی، کە دەشێ من بێ ئاگایانە هەنگاوم نابێتە ناو یارییەکی ترسناکەوە، هەوڵیدا هەندێك نهێنیم لەبارەی ڕۆمانەکەوە بۆ باس بکات.

وەك ولیەم وتی، دوای ئەو ڕۆژەی من ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ)م تێدا کڕی بوو، تێبینی دەکات کەسانێکی نامۆ و نەناسراو هاتوچۆی کتێبفرۆشییەکە دەکەن و بەوردی سەیری کتێبەکان دەکەن، وەك ئەوەی بەدوای شتێکی دیاریکراودا بگەڕێن. بەو ئەزموونەش لە کارەکەیدا هەیەتی، دەزانێت کێشەیەك ڕوویداوە. ئیدی دەچێت

دەفتەری کتێبفرۆشتنەکە دەهێنێت و ناوی ئەو کتێبانە وردبینی دەکات، کە لەو ڕۆژەدا فرۆشراون، کە ئەم لەوێ نەبووە. کاتێکیش ئەو ناوە نامۆیەی ڕۆلف فالکی نووسەری ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ) دەبینێت، تێدەگات کتێبێک بەهەڵە فرۆشراوە. چونکە وەك خۆی وتی، زۆر بەدوای ناوی ڕۆلف فالکدا دەگەڕێت، بێئەوەی هیچی لەبارەوە بدۆزێتەوە. پاشان لە وەسفی کڕیاری کتێبەکەدا، وەك کوڕە گەنجەکە بۆی باسدەکات، وامەزەندە دەکات، من ئەو کتێبەم کڕی بێت. ئەگەرچی لەبەر دڵنیایی خۆی، پرسیاری لە چەندین کڕیاریتریش کردووە.

کاتێکیش لەبارەی ڕۆلف فالکەوە پرسیارم لێکرد و وتم: ئەو ڕۆمانە چ گرنگییەکی هەیە؟ کتێبفرۆشەکە دەرگای نهێنی کتێبنووسە نەناسراوەکانی بەڕوودا کردمەوە، چونکە وەك پێیوتم، دەترسا بەهۆی ئەو کتێبەوە ڕووبەڕووی مەترسی ببمەوە.

ولیەم بەرەو ژوورێکی بچووکی پشتەوەی بردم، کە پڕبوو لە کتێبی کۆن و دانسقە و مێز و قەنەفەیەکی بچووکیشی لێ بوو. بە دیوارەکانیشیدا سەعاتێکی گەورەی کۆن و تابلۆیەك و وێنەی چەند نووسەرێك هەڵواسرابوون. لەو ژوورەدا باسی کتێبنووسە نەناسراوەکانی بۆ کردم.

لە مێژووی نووسیندا و لە سەردەمە جیاوازەکاندا، جۆرێك نووسەر هەبوون، نووسین و دەستنووسەکانیان بەناوی خوازراو، یاخود ناوی وەهمی و تەنانەت جاریش هەبووە بەبێ ناوی نووسەر بڵاوکردۆتەوە و کتێبەکانیان بەو شێوەیە دەستاو دەستی کردووە. ئەگەرچی هەندێکیان لەترسی کوشتن، لە مێخدان و سوتاندن بە دەستی فەرمانڕەوا و پیاوانی ئایین ئەم کارەیان کردووە، بەڵام هەشیان بووە ئەوەندە مەزن لە کردەی نووسینی ڕوانیوە، لەبەردەم سیحر و جوانیی پیت و وشەدا، خۆیان فەناکردووە و زاڵبوون بەسەر ئەو نێرگسییەتەی لە

ڕۆحی نووسەراندا بڵێسە دەدات، ئەویش بە نەنووسینی ناوی خۆیان، یاخود نووسین بەناوی وەهمییەوە. بەڵام ئەو کتێبنووسە نەناسراوانە، هەمیشە دوژمنیان هەبووە و بەدوایاندا گەڕاون و هەیان بووە ڕووبەڕووی مردن کراوەتەوە. ئیدی لە هەر سەردەمێکدا ئارەزووی نووسین بەناوی خوازراو، یاخود ناوی وەهمییەوە درێژەی هەبووە و تا ئێستاش لە زۆر وڵاتدا کەسانێك هەن لەبەر هەر هۆکارێك بێت، بەناوی خوازراوەوە دەنووسن. بەڵام نووسەرانی وەك ڕۆلف فالك لەوانیش جیاوازن.

منیش وتم: ئەوە شتێکی نامۆ و نەزانراو نییە باسی دەکەیت، چونکە لە دونیای نووسینی ئێمەشدا بەکارهێنانی ناویتر یاخود ناوی خوازراو هەبووە. بەڵام وەك دەڵێیت، کتێبەکەی ڕۆلف فالك جیاوازیی چییە لەوانیتر؟ ولیەمیش وتی: کە ڕۆمانەکەت گەڕاندەوە، ئەوکاتە بەوردی لەوە دەدوێین.

***

**مریەم هەستی بە ئازار و ناڕەحەتی کرد لە بەرموسەڵانیدا و ماوەیەکە بەهۆی هەوکردنێکی کەم لە میزەڵانیدا، نەیدەتوانی بۆ ماوەیەکی نۆد میز ڕابگرێت، بەڵام بوونی ناوی ولیەم وای لێکرد ئازارەکە لەبیر خۆی بەرێتەوە، چونکە دڵنیابوو پێشتر ئەو ناوەی بینیوە. هەستا و چوو ئەو پەڕەیەی هێنا کە لەناو کاغەزەکانی شێرکۆدا دۆزیبوویەوە و لەوێدا ناوەکەی ولیەمی بینی، کە لە تەنیشتییەوە وەسفێکی کەمی شێوە و ڕوخساری کرابوو، پاشان هەر بە کورتی نووسرابوو لە ڕووداوێکی تەمومژاویدا دەکوژرێت. پاشان ناوی ماریای بینی و بەهەمان شێوە وەک چۆن لە ڕۆمانەکەدا وەسف کرابوو، ئاوا بە کورتی وەسفێکی کەم کرابوو، هەروەها لە تەنیشتییەوە نووسرابوو: کتوپڕ ون دەبێت، یاخود خۆی دەکوژێت و گومان دەکرێت کوژرابێت. مریەم کاغەزەکەی لەگەڵ**

خۆی هەڵگرت، تا لە هەر شوێنێکدا ناوێکی نەناسراوی بینی، لە لیستی ئەم ناوانەدا بۆی بگەڕێت. چونکە وای بۆ چوو، ئەو ناوانەی لەو پەڕەیەدا نووسراون، ئەو کەسایەتیانە بن، کە لە ڕۆمانەکەدا باسکراون.

دوای ئەوەی پەردەی ژوورەکەی لادا، گەڕایەوە بۆ لای ڕۆمانەکە.

# نهێنی ڕەنگی ڕەش
## گفتوگۆ لەبارەی هونەری جووتبوونەوە

مـن لـە شـوێنێکدا باسـی ئـەوەم کـرد، نووسـتن لەگـەڵ ئافرەتێکی غەمگیـن، وەك ڕۆیشـتن وایـە بەتەمـدا. دەشـێ ئـەم لێکچواندنـە لەیەك کاتـدا مانایەکـی جـوان، یاخـود ناشـرین لەخۆیـدا هەڵبگرێـت و ئـەو مەبەسـتە ئاشـکرانەبێت کـە لەپشـتییەوە هەیـە. بـەڵام بـۆ مـن، ڕۆژە تەمـەکان، لـەو ڕۆژە پـڕ ڕازانـەن، کـە لـە منداڵییـەوە ئارەزوویەکـی سـەیرم بـۆی هەیـە و هەمیشـە حـەزم لـە ڕۆیشـتن بـووە بەنـاو ئـەو تەمانـەی قـورس دەنیشـنە سـەر ڕێگاکان و مـرۆڤ نازانێـت چـی لـە دەوروبـەری هەیـە. ئیـدی هـەر هەنگاوێـك دەبێتـە ئاشـکراکردنی نەزانـراو و نادیارێك ماریـاش ئـاوا بـوو.

کاتێک لای ولیەمی کتێبفرۆش هاتمە دەرەوە، دونیا تەواو تاریک بووبوو. زەنگم بۆ ماریا لێدا و داوام لێکرد ببینم. وا ڕێکەوتین پاش کەمێکیتر لەناو وێسگەی شەمەندەفەری ناوەندی شار و نزیک دووکانی گوڵفرۆشییەکە یەکتر ببینین. من پێش ئەو گەیشتمە ئەو شوێنە و لە دوورەوە بینیم جیاواز لە ڕۆژانی پێشوو، خۆی گۆڕیوە و تەنورەیەکی پەڕپەڕەی کورت و رینکۆتێکی ڕەشی لەبەردایە. لە وێستگەکە چووینە دەرەوە و لەبەر ماندوێتی ماریا، وەك خۆی وتی، لە نزیکترین کافێ دانیشتین، ئەگەرچی قەرەباڵغ بوو. بەڵام پاش ماوەیەك، هەرچەندە کزەیەکی دەهات، هەستاین و هەر بەو شەقامەدا بەرەو کەناری کەنداوەکە چووین. ئەو شەوە باسی بینینی ولیەمی کتێبفرۆش و ئەو قسە و باسانەم بۆ ماریا کرد، کە لەنێوانماندا ڕوویدا بوو. ماریاش بێدەنگ گوێی لێگرتبووم و ماندوو دیاربوو. بەڵام لەکەنار دەریاکە، هەندێکجار بێدەنگ دەڕۆیشتین و ماریا دەستی لەناو گیرفانی رینکۆتەکەیدا بوو. جاریش هەبوو لەبارەی جوانی کەنار ئاوەکە، یاخود باسکردنی سەفەرەوە دەدواین و لە قسەکانی ماریادا وا بەدەردەکەوت، زۆر پێویستی بە سەفەر هەبێت، ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت. لە شوێنێکدا کە شۆستەکە پێچێکی تێدەکەوت و دەچووەوە کەناری ئاوەکە، بە ماریام وت: چۆنە لەوێدا دابنیشین. ئەویش بەسەر لەقاند ڕەزامەندی دەربڕی و لاماندایە ئەو پێچە تاریکەوە و بەرانبەر ئاوەکە پاڵمان بەدیواری شۆستەکەوەدا. ماوەیەك بێدەنگ تێپەڕی، تا من دەستم برد و دەستم خستە گیرفانی رینکۆتەکەی ماریا و دەستیم گرت. ئەویش لەسەرخۆ یاری بە پەنجەکانم دەکرد و چاوی بڕیبووە شوێنێکی دوور. کاتێك لێمپرسی ماریا دەستت زۆر ساردە، سەرمات نییە؟ ئەویش هیچی نەوت و تەنها لێیڕوانیم. وتم ماریا چاوت

زۆر سەیرە.. بەوەی شتێك لە غەم وەك تەم لە سەری نیشتووە. ئەو تەمەش سیحرێکی سەیری داوە بە چاوت. ماریا تەنها بزەیەکی کرد و لەگەڵیدا پەنجەکانمی گوشی. دەمویست پێی بڵێم ماریا تۆ چەند بەتەم دەچیت. بەڵام لەوکاتەدا ئەو سەیری کردم و وتی: دەزانی بیر لە دوێنێ شەو دەکەمەوە، ئەوکاتەی پێکەوە نووستین، تۆ هەندێك شتت لەبارەی جووتبوون و پێکەوە نووستنەوە وت.. بیرت ماوە؟ منیش وتم کام قسەیەیان؟ ئەویش وتی: ئەوەی باسی هونەری جووتبوونت دەکرد. دەزانی سەیربوو بەلامەوە، چونکە من پێشتر وا بیرم لێنەکردبووەوە.

دوێنێ شەو دوای گێڕانەوەی بەسەرهاتی کووچە خوێناوییەکان و باسکردنی ئەوەی چۆن لە شەوێکدا ئەو خوێنەرانە دەکوژرێن، کە یەکێکیان باوکم دەبێت، ماریا پرسیاری ئەوەی لێکردم چۆن گەیشتمە ئەم وڵاتە. منیش ئارەزووم نەبوو هەموو ئەو ڕۆژانە بەیاد بهێنمەوە و بەکورتی باسی ئەوەم بۆ کرد چۆن لەترسی ئاگری شەڕی نێوان عێراق و ئێران، کە نەمدەویست بمکەنە سەرباز و لە چاڵێکدا بکوژرێم، بەیانییەك زوو بەرەو دێیەکی دوور هەڵدێم و ماوەیەك وەك سەربازی هەڵهاتوو لەوێ دەژیم. بەڵام تا دەهات بارودۆخەکە بەرەو خراپتر دەڕۆیشت و سوپاکەی سەددام دەستی بگەیشتایەتە هەرشوێنێك دەیسوتاند، لەلایەکیتریشەوە هێزە بەرهەڵستکارەکانی سەددام لەنێوان خۆیاندا لە شەڕێکی خوێناویدا بوون. ئیدی بەناچاری لەوێشەوە لەگەڵ سێ کەسیتردا قاچاخچییەکمان پەیداکرد و ڕێگای سنووری ئێرانمان گرتەبەر. بەڵام شەوێك لەڕێگا دوای ئەوەی کەوتینە بۆسەوە و لەگەڵ یەکەم دەسڕێژدا، قاچاخچییەکەمان کوژرا. ئیدی ماوەی چەند شەو و ڕۆژێك لەناو چیا و دۆڵەکاندا گیرمان خوارد، تا توانیمان خۆمان تەسلیمی سوپای ئێران بکەین و ماوەی دوو ساڵم لە زیندان و

ئۆردوگایەکی دووردا بەسەربرد، کە هەروەك زیندان وابوو. تا دواتر توانیم لە ڕۆژێکی چلەی زستاندا، وەك پەناهەندەیەك بەخۆم و تەنها جانتایەکی شانەوە بگەمە ئەم شارە. هەستمکرد باسکردنی ژیان لە گوندێکدا وەك سەربازێکی ڕاکردوو، هەڵهاتن لەدوای قاچاخچییەکەوە بەرەو وڵاتێکی نامۆ و ئەو ژیانە پڕ لە چەرمەسەرییە، زۆر سەرنجی ماریایان ڕاکێشابوو، کە دڵنیابووم وەك ئەوە وا بوو بەلایەوە، فیلمێکی سەرنجڕاکێشی بۆ بگێڕمەوە. بەڵام ترس، ئازار و عەشق لەو شتانەن دەبێت خۆمان ئەزموونی بکەین، تا لە تامەکەی تێبگەین..

ئەو شەوە کاتێك هەستم بە ماندوویەتی کرد و چووم بنووم، لە درەنگانێکدا ماریا دەرگای کردەوە و بێئەوەی ژوورەکە ڕووناك بکاتەوە، هاتە ناو جێگاکەمەوە. کاتێك لەشی بەر لەشم کەوت، زانیم ڕووتە و بۆنی مێیایەتی ئەو، شتێکی لە مندا بەئاگا هێنایەوە. شتێك وەك ئەوەی چەندین ساڵ بێت لەژێر چیایەکی سەهۆڵیندا نووستبێت و ئێستا گەرمی ژیانی تێگەڕابێتەوە. بەرەو ماریا وەرچەرخام و لە تاریکییەکەدا سەیرم کرد. ئەویش بەهەموو سووك و سۆڵیی جەستەیەوە فشاری دەخستە سەر لەشم. هەستمکرد ئافرەت قورساییەکی زۆر ناسکی هەیە و پێچەوانەی یاساکانی فیزیا کاردەکات و دەشتوانێت بەرپەرچی هەموو یاساکان بداتەوە. پێیوتم: مەبەستت چی بوو ئێوارە وتت مرۆڤ دوو جۆری هەیەو یەکێکیان لە بەرزییەوە سەیری خوارەوە دەکات و ئەویتریشیان بەپێچەوانەوە لە خوارەوە سەیری سەرەوە دەکات. دەستم برد و پەنجەم خستە ناو قژییەوە، وتم: ماریا تۆ دەتوانیت بیرێك بهێنیتە بەرچاوت، کە کەسێك لە بنەکەیدایە؟ ئایا ئەو کەسە بۆ کوێ دەڕوانێت؟ دیارە ئەو کەسە بەردەوام سەیری سەرەوە دەکات و بەهیوایە کەسێك بێت و ڕزگاری بکات. بەڵام جۆرەکەیتری مرۆڤ ئەوەیانە کە لەدەمی بیرەکەدا وەستاوە و سەیری بنی بیرەکە دەکات.

ماریا بە چپەوە وتی: مەبەستت لەم دوو کەسە چییە؟ منیش وتم ئەوەی بنی بیرەکە سەیری ئایندە دەکات و بیر لە ڕابردوو ناکاتەوە. بەڵام ئەوەی سەرەوە بیر لە ڕابردوو دەکاتەوە، بەوەی ئەو کەسە چۆن گەیشتۆتە ئەوێ.

دەمزانی ماریا لە تاریکییەکەدا چاوی تێبڕیوم و بەهێواشی پەنجەی لەسەر پشتم دەجولاند و کاتێك هەناسەی دەدا، مەمکی بەر سنگم دەکەوت. من وای دەبینم هەرکاتێك مرۆڤ لەسەر شاخێك یاخود قەڵایەکەوە، سەیری شارێك دەکات، بیر لە ڕابردووی ئەو شارە دەکاتەوە. بەڵام کاتێك لەناو شارەوە سەیری بەرزاییەك دەکات، بیر لە ئایندە دەکاتەوە. ئەمە لەکاتی جووتبووندا زۆر بەڕوونی دیارە. کاتێك ئافرەت، وەك لەبنی بیرەکەدا بێت، پاڵدەکەوێت و باوەش بەو پیاوەدا دەکات لەسەرییەوەیە، ئەوا باوەش بە ئایندەدا دەکات و دەیەوێت دڵنیابێت لە ئایندە. بەڵام کاتێك هەر ئەو ئافرەتە دەچێتە سەرەوە و سەیری پیاوەکە دەکات لەژێرییەوەیە، ئەوا بیر لە ڕابردوو دەکاتەوە. بۆ پیاوەکەش هەروایە. دەشێ ئەم پەیوەندییە لەسەر ئاستی کلتوورەکانیش گرنگی هەبێت و لای ئێمە، لەکاتی جووتبووندا زیاتر ئافرەت لەژێرەوەیە، چونکە زیاتر غەمی ئایندەیەتی و دەیەوێت باوەش بە ئایندەیدا بکات و دڵنیابێت. بەڵام پیاو لەسەرەوەیە، چونکە زیاتر غەمی ڕابردوویەتی و سەیری ڕابردووی ئافرەتەکە دەکات. تەنانەت ئەم بۆچوونە بۆ تێڕوانینی نێوان ئێمە و ئێوەش ڕاستە. تۆ سەیری گۆی زەوی بکە، دەبینیت ئەوروپا دەکەوێتە بەشی سەرەوە و ئێمەش دەکەوینە خوارووی ئەوروپاوە. کاتێك ئێوە سەیری ئێمە دەکەن، کۆشکی پڕ کەنیزەك، حەرەمسەرا، پیاوانی دڵڕەق و چیرۆکی سەیر و سەمەرەی عەشق و ئایینەکان، فەرش و دەف دەبینن. کە ئێمەش لە ئێوە دەڕوانین، وەك ئەوەی بەسەرمانەوە بن، ڕابردووتان فەرامۆش

دەکەین و ئێوە وەك ئاینده و هێمای پێشکەوتن دەبینین. تۆ بیرت لەو شێوازی جووتبوونە کردۆتەوە، کە پێیدەڵێن فەرەنسی؟ دەزانیت ئەو شێوازە ناوێکیتری هەیە و پێشی دەوترێت شێوازی ئاژەڵی. چونکە هەر بە شێوازی جووت بوونی مەڕ و مالات دەکات و کەسیان لە سەرەوە، یاخود لە ژێرەوە نییە. بەڵکوو هەردووکیان ئاسۆیین و ڕوویان بەرەو یەك ئاراستەیە. دەشێ ئەو ناوەی دووەمیان تەنها بۆ ئەوە نەگەڕێتەوە، کە لە شێوە جووتبوونی ئاژەڵە، بەڵکوو بۆئەوە بێت، کە لەو شێوازەدا نە ڕابردوو، نە ئاینده بوونی نییە. بەڵکوو تەنها ئێستا هەیە. هەروەك مەڕ و مالات، کە تەنها ئێستایان هەیە.

ماریا بەدەنگێکی نزم وتی: هەرگیز وابیرم لە جووتبوونی نێوان نێر و مێ نەکردۆتەوە و ناشمەوێت ئێستا بیر لە ڕابردوو، یاخود ئاینده بکەمەوە. دوای ئەوە هەستم کرد هەناسەی نزیك دەبێتەوە لێم و دەستی گرتم و لەسەر کەمەری خۆیی دانا.

وتم: ماریا بۆ بیر لەو قسانەی دوێنێ شەو دەکەیتەوە؟ ئەویش وتی: چونکە بێئەوەی بمەوێت، هەموو ئەمڕۆ بەپێی ئەو بۆچوونەی تۆ سەیری دەوروبەرمم کردووە، بەڵام من نە ڕابردوو، نە ئاییندەی تۆم ناوێت. بەڵکو ئێستاتم دەوێت و حەزناکەم نە لەناو بیرەکەوە سەیرت بکەم، نە لە دەمی بیرەکەوە. منیش وتم: دەتەوێت وەك کەسێکی ناو ئەو شەمەندەفەرە بم، کە خۆت باست کرد؟ ماریا وتی: نا... ئەوەش ئاسان نییە. پاشان وتی: هەستدەکەم ئێرە ساردە و باشترە کەمێك پیاسە بکەین. منیش دەستم لە گیرفانی دەرهێنا و لەسەرخۆ بە کەناری ئاوەکەدا کەوتینە ڕێ. لە شۆستەکەی ئەوبەرمانەوە چەند کەسێك وەستابوون و سەرقاڵی قسەکردن بوون. وتم: ماریا سەیرکە... مرۆڤەکان چەند بە دوورگە دەکەن. وەك ئەوەی هەریەکەیان دوورگەیەکی تەنیا و تەریك بێت، لەم زەریایەی ناوی ژیانە. بەڵام ماریا

بێدەنگ لە تەنیشتمەوە دەڕۆیشت. لەناکاو وتی: حەزدەکەم چیرۆکێکم بۆ بگێڕیتەوە. منیش بەسەرسامییەوە وتم: چیرۆکی چی؟ ئەویش وتی: چیرۆکێك لەبارەی هەرچییەکەوە بێت، گرنگ نییە. چونکە دڵنیام تۆ دەتوانیت تام و چێژ بدەیت بەو شتەی دەیگێڕیتەوە. پاش کەمێك بیرکردنەوە وتم: هەبوو نەبوو لە سەردەمێکدا هێشتا نە شەو بوونی هەبوو، نە تاریکی و سێبەر، شارێکی دڵگیر و قەشەنگی پڕ لە باخچەی ڕازاوە هەبوو، هەموو ڕەنگە ئاڵ و والاکان لە ڕازاندنەوەیدا بەکارهێنرابوون و تەنها ڕۆژ لەو شارەدا بوونی هەبوو. خەڵکی ئەو شارەش ڕەنگساز بوون و کاریان دروستکردنی ڕەنگ و بازرگانی کردن بوو بە ڕەنگەکانەوە. کاروانەکان باری ڕەنگی سور و زەرد و سەوزیان بەرەو ناوچە دوورەکان دەبرد، ڕەنگەکانیان بە کارامەییەوە تێکەڵ بەیەکتر دەکرد و ڕەنگی تریان لێدروستدەکردن و دەیانفرۆشتنەوە. ڕۆژێك سەیردەکەن ڕەنگێکی ناشرین و غەمهێنەر لەناو بۆتە و کەمۆڵەی ڕەنگ دروستکردنەکانیاندا پەیدابووە. ئەو ڕەنگەش، ڕەنگی ڕەش دەبێت. ئیدی خەڵکەکە بەو ڕەنگە غەمباردەبن و ترسیان لێدەنیشێت، بەوەی هیچ جوانییەکی تێدا نابینن. تا دێت ڕەنگی ڕەش زیاتر و زیاتر دەبێت و بازرگان و ڕەنگگرەوەکانیش دەستەوسان دەبن لەبەردەم ئەو ڕەنگە غەمهێنەرەدا. تا ڕۆژێك وێنەکێشێك تابلۆیەك بە ڕەنگی ڕەش دەکێشێت و جوانییەکی سیحرئامێزی تێدا دەدۆزێتەوە و ئیدی خەت خۆش و وێنەکێشەکان لە تابلۆکانیاندا ڕەنگی ڕەش بەکاردەهێنن و جوانی و ڕەونەقێکی سەیر لە ناشرینیی ڕەشدا دەدۆزنەوە. لە دوای ئەوەوە مرۆڤ نیوەی ڕۆژ ڕەش دەکات و سێبەر و تارمایی بۆ شتەکان دەدۆزێتەوە، تا جوانییان کامڵ بێت.

***

لەگەڵ خوێندنەوەی دوا دێڕی ئەو بەشەدا، زەنگی مۆبایلکە لێیداو مریەم هێند بەپەلە هەستا، سەرسمێکیدا و خۆی بە دیوارەکە گرتەوە. هەر کە گوێی لە دەنگەکە بوو لەو سەری هێڵەکەوە دەهات، ناسییەوە دەنگی شێرزادە. سەرەتا مریەم هەستی بە شڵەژان کرد و کەمێک تێکەڵ و پێکەڵ وەڵامی دایەوە، تا وردە وردە ئارامیی بۆ گەڕایەوە.

شێرزاد ئەوەی بە مریەم وت، کە بەیانی لە کونسوڵخانەی عێراق بووە و کارەکەی هیچ ئەنجامێکی وای نەبووە، ئیدی بڕیاریداوە بمێنێتەوە و چەند ڕۆژێکی پشوو لە ستۆکهۆڵم بەسەر بەرێت. دوای ئەوە پێشنیاری بۆ کرد، ئەگەر کاتێک بۆی کرا و ئارەزووی لێبوو، ئەوا دەتوانن یەکتر ببینن. مریەم هیچ وەڵامێکی دیار و ڕێکی نەدایەوە، جگە لەوەی وتی: ئەگەر کاتم هەبوو خۆم تەلەفوونت بۆ دەکەم. دوای ئەوە شێرزاد، پێش ئەوەی کۆتایی بە گفتوگۆکەیان بهێنێت، وتی: ئەم شارە لەم وەرزەدا ئەوەندە ڕەنگینە دەڵێی بەتایبەت بازرگانی ڕەنگی هەیە و لە ڕێگای دوورەوە بارە ڕەنگی بۆ دەهێنن.

مریەم پەلە بوو لە داخستنەوەی تەلەفوونەکە، چونکە ئەو بەشەی تازە لە خوێندنەوەی ببووەوە و لەبارەی سێکسەوە بوو، زۆر سەرنجی ڕاکێشابوو، دەیویست بەراوردی ئەوەی لەو بەشەدا نووسرابوو، بەو ساتانە بکات کە لەگەڵ شێرکۆدا نووستبوو. هەرچەند ئەو ساتی پێکەوەبوونانەی دەهێنایەوە یادی خۆی، تارمایی شێرکۆی زیاتر لە پشت دێڕەکانەوە دەبینی، بەوەی شێرکۆ بۆ خۆی ئاوا سەیری ئەو پەیوەندییەی دەکرد. لەناکاو بیری دوا قسەی شێرزادی کەوتەوە، کە باسی لە بازرگانی ڕەنگ کردبوو، وەک چۆن لەو حیکایەتەدا هاتبوو، کە پێش کەمێک خوێندبوویەوە. هەستی کرد شتێک پاڵی پێوە دەنێت بۆ بینینی شێرزاد. دەستی برد و بەو نیازەی دوای نیوەڕۆ کاتی هەیە بۆ بینینی، زەنگی بۆ ژمارەکەی لێدا، وەک ئەوەی شێرزاد چاوەڕوانی

ئەم بێت، یەکسەر وەڵامی دایەوە. مریەم لەوێدا و نەیزانی بۆ ڕای گۆڕی و سبەینێ دوای نیوەڕۆی دانا بۆ یەکتر بینین، ئەویش لە مەیدانی سلوسن. تا ئەو یەکتر بینینەش، کاتێکی زۆری لەبەردەمدا بوو. چووە بالکۆنەکە و لەگەڵ خۆیدا پاکەتی جگەرەکەی و کوپێک قاوە و دەستنووسی ڕۆمانەکەی برد.

❋❋❋

# پیتە نادیارەکان

## خوێندنەوەی کاغەزی سپی

ئەمڕۆ، کاتێک بە ڕێگاوە بووم بۆ لای کتێبفرۆشییەکەی ولیەم، بیرم لەو چیرۆکە دەکردەوە کە ئەو ئێوارەیە لە خەیاڵمدا بوو، دەمویست بۆ ماریای بگێڕمەوە، کاتێک لە کەناری کەنداوەکە پیاسەمان دەکرد. بەڵام نازانم بۆ لە جێگای ئەم چیرۆکە، چیرۆکی (شاری ڕەنگەکان)م بۆ گێڕایەوە. ئەو چیرۆکەی ویستم بۆی بیگێڕمەوە، باسی لە کەسێك دەکرد، پێچەوانەی هەموو مرۆڤێك، دوو ڕۆحی دەبێت، واتا بە دوو ڕۆحەوە دەژی. لەکاتێکدا حەزی لە پیاسەی شەو درەنگان دەکرد، لەهەمان کاتدا چێژی لە گەرمای ڕۆژە درێژەکانیش دەبینی. کاتێك عاشقی کچێکی قژ کاڵی باڵابەرزی گەڕەکەکەیان دەبوو، لە هەمان کاتدا ڕۆحەکەیتری شەیدای کچێکی باڵاکورتی قژ ڕەش دەبوو. کە بە شەوقەوە دەیویست کتێبێك بخوێنێتەوە، لەهەمانکاتدا خەو دەیبردەوە. کاتێك دەیویست پشتگیری لە ئازادی مرۆڤ بکات، لەهەمانکاتدا پاساوی بۆ سەرکوتکردن دەهێنایەوە. ئەوکاتەی پڕ دەبوو لە ژیان و دەیویست باوەش بە ژیاندا بکات، لەهەمانکاتدا ڕۆحەکەیتری، بیری لە خۆکوشتن دەکردەوە. تا سەرئەنجام هاوسەنگی تێکدەچێت و شێت دەبێت. ئەمە تەنها چیرۆکێك بوو، ویستم بۆ ماریای بگێڕمەوە.

وەك دامنابوو، دونیا تەواو تاریك ببوو، کاتێك گەیشتمە کتێبفرۆشییەکەی ولیەم. دەرگاکەم کردەوە و بەئەسپایی چوومە ژوورەوە. بەڵام ڕاستەوخۆ کەسم نەبینی. تا دوای کەمێك گوێم لە خشەخشی قاچێك بوو لە ژوورەکەی دواوە هات و دەنگێك، کە دەنگی ولیەم بوو، وتی: دوو ڕۆژە چاوەڕوانتم. وەرە قاوەیەك تێکە و بچینە ژوورەکەی دواوە. بەلامدا تێپەڕی و چوو دەرگاکەی دەرەوە دابخات. لەگەڵیدا وتی: ئەم نەخۆشی شەکرە نەفرەتییە وا دەکات هەر بەڕێگای تەوالێتەوە بیت. لەگەڵ قسەکەیدا پێکەنی و دووجار بە شانمیدا کێشا.

کاتێك بێئەوەی هیچ بڵێم، (ڕۆمانی چەتەکانی خەیاڵ)م دایە دەستی، ڕووی کرایەوە و بە خۆشییەوە لێیوەرگرتم. کتێبەکەی لە دەستیدا ئەمدیو و ئەودیو پێکرد و چاوی بە نووسینەکانیدا گێڕا. لەگەڵیدا وتی: دەبێت ئێستا نهێنی هاتوچۆ و گەڕانی وردی ئەو کەسە نامۆیانە بدۆزینەوە، کە ماوەیەکە دێنە ئێرە. تۆ دەزانیت هەر کتێبێك لەمانە، کە نووسەری نادیار و نەناسراو دەیاننووسێت و بەدزییەوە لە جێگایەکدا جێدەهێڵرێن، لە شوێنێکیدا نامەیەك یاخود زانیارییەکی نهێنی بۆ ئەو خوێنەرە هەیە، کە کتێبەکەی دەکەوێتە دەست. تۆ هیچ شتێکی وات نەبینیوە لەم ڕۆمانەدا؟ منیش بە سەرسامییەوە وتم: نا. دوای ئەوە ولیەم زەڕەبینێکی هێنا و هەندێك لاپەڕەی پێ سەیر کرد. پاشان کتێبەکەی دانا و چوو مۆمێکی هێنا. بەدەم داگیرساندنییەوە وتی: مرۆڤ بوونەوەرێکی ئاڵۆزە و دەشێ لەیەك کاتدا هەم فریشتە و هەم شەیتانیش بێت. من ئەگەرچی لە مەبەستەکەی تێنەگەیشتم، وتم: وەك ئەوەی دوو ڕۆحی هەبێت. ئەویش سەیری کردم و وتی: وەك ئەوەی دوو ڕۆحی هەبێت. پاشان دوایەمین لاپەڕەی کتێبەکە، کە نیوەی سپی بوو، بە وریاییەوە لەسەروو مۆمەکەیەوە ڕاگرت و بە هێواشی

دەستی دەگێڕا تا گەرمیی مۆمەکە لەژێرەوە بە شوێنە سپییەکاندا بگێڕێت و لەبەر خۆشییەوە دەیوت: ئێستا ئێمەش لەگەڵ شەیتانەکەدا دەجەنگین. هەستم کرد وردە وردە شتێك وەك تارماییەکی ڕەش لە گۆشەیەکی ڕووبەرە سپییەکەدا بەدەرکەوت و ولیەم لەخۆشیدا پێکەنی.
من چەند خۆم جوڵاند نەمتوانی ئەو تارماییە ڕەشە جوان ببینم و بزانم چییە، بەڵام ولیەم مۆمەکەی دوور خستەوە و زەڕەبینەکەی هەڵگرتەوە.
منیش بێدەنگ سەیرم دەکرد. ولیەم وتی: ئەوەتا دەبینیت. کتێب و زەڕەبینەکەی بۆ درێژ کردم و منیش لێم وەرگرت تا سەیری ئەو تارماییە بکەم، کە لە لاپەڕەکەدا بەدەرکەوت. بە یارمەتی زەڕەبینەکە توانیم بەروارێکی کاڵ و ناوێك ببینم لە لاپەڕەکەدا نووسرابوو. بە ولیەمم وت: ئەم بەروار و ناوە مانای چییە لێرەدا بە نهێنی نووسراون؟ پاشان تۆ ئەمەت چۆن زانی؟

ولیەم بە خۆشییەوە پاڵیدایەوە و هەر لە جێگای خۆیەوە درزێکی کردە پەنجەرەکەی تەنیشتی، کە بەسەر تاریکیدا دەیڕوانی. جگەرەیەکی داگیرساند و وتی: نهێنی ئەو بەروار و شوێنە ئەوەیە، کە نووسەری ئەم کتێبە، کات و شوێنی کتێبی داهاتوو بە خوێنەری ئەم کتێبە دەڵێت. لەم ڕێگایەشەوە ئەو نووسەرانە پەیوەندی بەیەکەوە دەکەن و لەیەکتر ون نابن. ئەو نووسینەش بە ئاوی پیاز دەنووسن، کە بەگەرم کردنی، ڕەش دادەگەڕێت و بەدەردەکەوێت. ئێستا ئێمە نهێنی کتێبی داهاتوومان کەوتۆتە دەست. ئەمەش مەترسییەکی گەورەیە. بەڕاست تۆ ئەم ڕۆمانەت خوێندۆتەوە، باسی چی دەکات؟ منیش ئەوەندەی توانیم، کورتەیەکم لە ڕۆمانی چەتەکانی خەیاڵ بۆ باسکرد و ولیەمیش بە دیقەتەوە گویی لێگرتبووم و بە پەنجە یاری بە ڕیشی دەکرد. کاتێکیش لە باسی ڕۆمانەکە تەواوبووم، وتم: تۆ بۆ ئەم شتانە بۆ من باس دەکەیت؟ ولیەم بێئەوەی وەڵامم بداتەوە، هەستاو لە

پەنجەرەکـەوە، دوای ئـەوەی دایخسـت، سـەیری تاریکییەکـەی دەرەوەی کـرد و وتـی: سـەیرە ئـەوەی تـۆ لـەو ڕۆمانـە باسـی دەکەیـت، زۆر بـە نووسـینەوەی مێـژووی دەسـتەی کتێبنووسـە نهێنییـەکان دەکات. ئەمـەش لـە کاتێکدایـە، دوو ڕووداوی سـەیر لەئـارادان. یەکێکیـان گومـان کردنـە لـە مەرگـی پابلـۆ نێـرودا و ئـەوی تریشـیان دیارنەمانـی کتێبفرۆشـێکی خەڵکـی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتە لـە باشـووری سـوید. بەڕاسـت تـۆ خەڵکـی کوێیـت؟ منیـش بەسـادەیی وتـم خەڵکـی کوردسـتانم. ئەویـش سەرسـامی خـۆی نیشـاندا و وتـی: دەزانیـت ئـەو کتێبفرۆشـەی لـەم وڵاتـەدا دیـار نەمـاوە، کـوردە. گەڕایـەوە شـوێنەکەی خـۆی و لەسـەر کاغەزێـك شـتێکی نووسـی، دوای ئـەوەی لـە چەکمەجەیەکـدا قەڵەمێکـی دەرهێنـا. بـەڵام دوای ئـەوەی کاغەزەکـەی دایـە دەسـتم، بینیـم هیچـی لەسـەر نەنووسـراوە. ئەویـش بـە بزەیەکـەوە چاوێکـی لێداگرتـم و وتـی: دوای ئـەوەی چەتەکانـی خەیاڵـم خوێنـدەوە، یەکتـر دەبینینـەوە. منیـش وام نیشـاندا لـە مەبەسـتەکەی تێگەیشـتووم، کاغەزەکـەم خسـتە گیرفانمـەوە و بەنیـازی ڕۆیشـتن لـە دەرگای پشـتەوە، هەسـتام.

***

**مریـەم ڕۆمانەکـەی لەسـەر مێـزە بچووکەکـەی تەنیشـتی دانـا و سـەیری باخچەکـەی بەردەمـی کـرد. هەسـتی بـە بۆشـاییەکی سـەیر دەکـرد لـە ناوەوەیـدا. بیـری کـردەوە باشـترە بچێـت کاتژمێرێـک وەرزش بـکات و ئەگـەر ئارەزووشـی کـرد، کەمێـک مەلـە بـکات. دوای ئـەوەی جلـی وەرزش و مەلەکـردن، دەبەیـەک ئـاو، خاولـی و دوو سـێو و مۆزێکـی لە جانتایەکی شـان کـرد، جووتێـک نەعلـی سـووکەڵەی لـە پێکـرد و بـەرەو هۆڵـی وەرزشـەکە ڕۆیشـت، کـە هـەر سـەد مەترێـک لـە ماڵەکەیـەوە دوور بـوو.**

**نزیکـەی سـێ چارەکـە سـەعات، لـە هۆڵـی وەرزشـکردنەکە مایـەوە و بـە**

درێژایی ئەو ماوەیەش، لە ڕێگای هێدفۆنی مۆبایلەکەیەوە، گوێی لە گۆرانی گرتبوو. کە هەستی بە ماندوێتی کرد و جلە تەسکەکانیشی، کە تەواو بە لەشیدا نووسابوون، پەڵەی عارەق لەسەری بڵاوبووبوونەوە، بەرەو بەشی خۆشۆردنەکە ڕۆیشت و دووشێکی کرد و مایۆ و ستیانێکی ڕەشی لەبەر کرد و چوو بۆ حەوزی مەلەکردنەکە، کە لەگەڵ چوونە ناو ئاوەکەیەوە، هەستی بە ئارامی کرد. دوای ماوەیەک هاتە دەرەوە و لە سەر کورسییەک دانیشت و لەژێر هەستێکی کەم بە برسێتی و بەدەم سەیرکردنی مەلەکەرانەوە، لەسەرخۆ دەستی بە میوە خواردن کرد. ئەوەی خۆش بوو بەلایەوە، ئەوەبوو بیری لە هیچ نەدەکردەوە.

بۆ شەوەکەشی نەیویست بگەڕێتەوە سەر ڕۆمانەکە، لەجیاتی ئەوە تەلەفوونێکی بۆ خوشکی کرد لە سلێمانی و دواتریش بەدەم سەیرکردنی تەلەفزیۆنەوە، لەگەڵ هەلالەدا قسەی کرد.

***

## ڕۆژی ١٦ای سێپتەمبەر

بەیانییەکی گەرم بوو. مریەم زوو بەئاگاهات و یەکەم شت بەدەم خۆکێشانەوەوە بیری لێکردەوە، بینینەکەی شێرزاد بوو. وەک ئەوەی تازە بیری لێبکاتەوە بۆ دەیویست بیبینێت؟ لەوانەیە ئەو لێکچوونە بووبێت لەگەڵ شێرکۆدا هەیبوو؟ نەیویست زۆر خۆی بەوەوە سەرقاڵبکات و لێگەڕا بۆ کاتی یەکتربینینەکە. چونکە چەند ڕۆژێکی کەمی مابوو پشووەکەی تەواو ببێت و بگەڕێتەوە سەر کار. پاشان هەر ئاوا بۆ ماوەیەک لەناو جێگاکەدا مایەوە و هەر بەو شێوەیەش دەستی بە خوێندنەوەی ڕۆمانەکە کرد، وەک ئەوەی بیەوێت تەواوی بکات و بزانێت چی ڕوودەدات.

# نامەی یەکەم
# گەڕان بەدوای وێنەی شەیتاندا

هاوڕێی ئازیزم (ع.م)

پاش سڵاو و ڕێز

ئەگەرچی ئێمە لەترسی ئاشکرابوونی ئەو نووسینانەی لەبارەی کتێبنووسە نەناسراوەکانەوە بۆت دەنێرم، وا ڕێکەوتبووین تۆ نامەم بۆ نەنووسیت و تەنها هەوڵی پاراستن و هەڵگرتنی ئەو نووسینانە بدەیت، کە بۆتی دەنێرم. ئەگەرچی دەشێ ئەم ترسەی من، هیچ پاساوێکی نەبێت. بەڵام شتێك لە ناوەوەمدا پێمدەڵێت من پێم ناوەتە ڕووبەرێکی پڕ ڕاز و سامناکەوە. چونکە دوای دانیشتنم لەگەڵ ولیەمی کتێبفرۆشدا و کاتێك زۆرێك لە ڕۆژنامە عەرەبی و (ئێس ڤێ دێ)و (داگینس نیهێتەر)ی سویدیی ٨ی ئەپریل گەڕام، بینیم زۆربەیان لە لاپەڕەی کلتوریاندا لەبارەی هەوڵی هەڵدانەوەی گۆڕەکەی پابلۆ نێروداوە نووسیویانە و باسی ئەو گومان و تەمومژە دەکەن، لەمردنی نێرودادا هەیە، کە لە ٢٣ی سێپتەمبەری ١٩٧٣دا و هەر ١٢ڕۆژ دوای کودێتاکەی ژەنەڕاڵ پینۆشییە دژی سیلڤادۆر ئەلەندی. بەپێی قسەکانی (مانۆیل ئارایا)ی تەمەن ٦٥ساڵ، کە چالاکوانێکی پارتی کۆمۆنیست و هاوەڵی نێرودا بووە، نێرودا دوای چەند کاتژمێرێك لە لێدانی دەرزییەك لە نەخۆشخانەی سانتا

ماریيا لە سانتیاگۆی پایتەخت، مردووە. زۆربەی ئەوانەش نێزودایان لە دوا ڕۆژەکانیدا بینیوە، جەخت لەوە دەکەنەوە باری تەندروستیی نێرودا بەدەست شێرپەنجەی پرۆستاتەوە هێندە خراپ نەبووە تا ئاوا کتوپڕ بیکوژێت. پاشان بەپێی گێڕانەوەکان بێت، نێرودا هەستی بە چاودێری و ڕاوەدونان کردووە و بیری لەوە کردۆتەوە شیلی بەجێبهێڵێت و گوانزالۆ مارتینزی کونسوڵی مەکسیکیش لە سانتیاگۆ، پێشنیاری ئەوەی بۆ کردووە لەڕێگای ئەوانەوە لە ٢٤ی سێپتەمبەردا شیلی بەرەو مەکسیك بەجێ بهێڵێت. بەڵام ڕۆژێك پێش ئەوە مردووە. ئایا ئەو گومانکردنە لە مردنی نێرودا بەدەستی پیاوانی پێنوشییەی دیکتاتۆر و هەڵدانەوەی گۆڕەکەی تا لەڕێگای پشکنینەوە ڕاستیی مردنەکەی بزانن و دیارنەمانی کتێبفرۆشێك لە باشووری سوید بەناوی (عومەری مەکتەبە)وە و گەیشتنی ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ) بەدەستم، تەنها ڕێکەوتن؟ پاشان بیرمان نەچێت پابلۆ نێرودا ناوێکی خوازراوی (ریکاردۆ ئەلیسیر نێفتالی ریيس باسوالتۆ)یە، کە لە ١٢ی یولی ١٩٠٤ لەدایك بووە و لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا نازناوی پابلۆ نێرودا بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت. بەڵام ئەوەی لە مردنی عومەری مەکتەبەدا سەیرە، ئەوەیە نۆ مانگ ون دەبێت تا ڕاوچییەك لە زەلکاوێکدا تەرمەکەی دەدۆزێتەوە. ئایا ئەو کە لە ٤ی مانگی ئۆگوستی ٢٠١٢ لەماڵی کچەکەی دەردەچێت و نۆ مانگ ون دەبێت تا لە ١ی مانگی ئایاری ٢٠١٣دا دەیدۆزنەوە، هیچ ئاماژەیەکی تێدایە بۆ چەمکی لەدایکبوون؟ ئەگەر منداڵ نۆ مانگی پێویست بێت بۆ لەدایکبوون، بەڵام ئەمیش ونبوونەکەی نۆ مانگی پێدەچێت تا دەدۆزرێتەوە. بەڵام بە مردوویی. ئەوەی من گومانی لێدەکەم کە ئەم نۆ مانگی ونبوونەی سیمبولێك بێت بۆ ئاشکرابوون و لەدایکبوونی ڕازێك.

بەهەرحاڵ دوێنێ نامەکەتم خوێندەوە و لە ئێستادا ناتوانم هیچ ڕوونکردنەوەیەك لەسەر پرسیار و گومانەکانت بدەم. چونکە ئەو شتانەش

بۆ خۆم نادیار و نائاشکران و منیش بۆ خۆم لەکەسێك دەچم، کە شەوێکی نووتەك بەچرایەکەوە ڕێ بکات و بتوانێت تەنها تا سنووری ڕوناکیی چراکە ببینێت و نەزانێت لەولاترەوە و لە تاریکییەکەدا چی هەیە. هەربۆیە حەزدەکەم لەم نامەیەدا باسی دوای سەردانی کردنەکەمت بۆ بکەم بۆ لای ولیەمی کتێبفرۆش. ئەوەبوو کاتێك لای ئەو هاتمە دەرەوە و دەمویست لەڕێگای کوڵانێکی لاوەکییەوە بگەمەوە سەر وێستگەی شەمەندەفەر و بەرەو ماڵەوە بڕۆم، کە هیچ ڕێبوارێکی پێدا نەدەڕۆیشت و تەنها دەنگی خرمە خرمی باران دەهات. لەناکاو گوێم لە دەنگی پێی کەسێك بوو لەدوامەوە. منیش خۆنەویستانە ئاوڕم بۆ دایەوە، بەڵام لەبەر ئەو شەپقە گەورەیەی لەسەریدا بوو، نەمتوانی دەموچاوی ببینم. نازانم بۆ وا هەستم کرد سەرخۆش بێت. ئەگەرچی گوێم پێنەدا، بەڵام کەمێك خێراتر لە پێشوو لە ڕۆیشتن بەردەوام بووم. کتوپڕ لەدواوە هێرش کرایە سەرم و بە پاڵێك درام بە دیوارەکەدا و کەوتم. هێرش بەرەکە گورج پەلاماری جانتاکەی دام و لە شانی کردمەوە و هەڵهات. من بۆ ماوەیەك لەجێگای خۆم نەبزوام و سەیری ئەو کەسەم دەکرد، کە بە جانتاکەی منەوە هەڵدەهات. تەنها کارێك کردم ئەوەبوو دڵنیابم لەوەی کاغەزە سپییەکەی ولیەم لە گیرفانمدایە. من ناتوانم لەوە زیاتر لەو ڕووداوە بدوێم و هیچ ڕاڤەیەکیشم بۆی نییە، بەوەی بڵێی ئەو کەسە لانەوازێك نەبووبێت و بە ئومێدی شتێکی گران بەها، پەلاماری جانتاکەمی نەدابێت؟ یاخود بەڕاست بڵێی پەیوەندییەکی بە ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ)ەوە نەبێت؟ من هیچ وەڵامێکی ئەم پرسیارەم لا نییە و ناشمەوێت خۆمی پێوە خەریك بکەم، چونکە زۆرجار مرۆڤ پێویستی بەوەیە سەرچاوەی ترس و نیگەرانی لە خۆی دووربخاتەوە و هەوڵبدات ڕۆتینی ژیانی تێکنەچێت.

تەنانەت تا گەیشتمە ماڵەوە و دواتریش ماریا لە دەرگایدا، هەوڵمدا

هیچ بیر لەوە نەکەمەوە، کە ڕوویدا. بەڵام کاتێك پرسیاری ئەوەم لە ماریا کرد، کە ئەو بەنیاز نەبووە شەو بێتەوە لام، ماریا وتی:: ئێوارە کە گەڕاوەتەوە، بینیویەتی دەرگای ژوورەکەی شکێندراوە و شتەکانی دراون بەسەر یەکدا، بەڵام هەستی نەکردووە جگە لە دیارنەمانی نووسخە لەبەر گیراوەکەی ڕۆمانی چەتەکانی خەیاڵ، هیچ شتێك رابێت. منیش پرسیاری ئەوەم لێکرد پۆلیسی ئاگادار کردۆتەوە، ماریا بە غەمبارییەوە سەری ڕاوەشاند و وتی: بەڵام هەستدەکەم ئەو کەسەی ئەو کارەی کردووە، تەنها بەدوای ڕۆمانی چەتەکانی خەیاڵدا گەڕاوە و هیچ مەبەستێکیتری نەبووە. من نەمویست باسی پەلاماردانەکەی خۆمی بۆ بکەم، تا نەترسێت. بەڵام ئەوەش جێگای گومانم بوو، بۆ ئەو کەسە چۆتە سەر ماڵی ماریا، نەوەك من؟ وەك ئەوەی ئەو کەسە ئاگاداری هەندێك وردەکاری بێت و بزانێت ڕۆمانەکە لە ماڵی مندا نییە. ئەوکاتە بەپەلە هەستام و بەرەو تەنەکەی خۆڵەکە چووم، چونکە بیرم کەوتەوە لەکاتی کۆپی کردنی ڕۆمانەکەدا، بەهۆی هەڵەی منەوە، ناچاربووم بەشی یەکەمی دووجار کۆپی بکەمەوە. چونکە ناشرین دەرچووبوو، کە بێ گوێ پێدان فڕێمدابووە ناو تەنەکەی خۆڵەکەوە و وەك دەزانیت، بۆتم ناردووە.

ئەوشەوە ویستم کەمێك ترسی ماریا بڕەوێنمەوە، هەربۆیە هەوڵمدا چیرۆکێکی بۆ بگێڕمەوە لەبارەی وێنەی شەیتانەوە. وتم: جارێکیان خۆشنووسێك دەبێت، کاری لەبەرنووسینەوەی دەستنووس و نامە دەبێت و یەکێك دەبێت لە ناسخە بەناوبانگەکان، کە دەیتوانی بەشێوەیەکی جوان و سەرنجڕاکێش لاپەڕەی دەستنووسەکان بڕازێنێتەوە و وێنە و زەخرەفەی ڕەنگا و ڕەنگیان تێدا بکێشێت. ناسخەکە بەو تەمەنەی لەگەڵ پیت و وشەدا بەسەری بردووە، دەگاتە ئەو باوەڕەی لەناو ئەو هەموو دەستنووس و بەیاز و کەشکۆلانەی هەیە، دەشێ دانەیەك یاخود

زیاتریان، شەیتان نووسیبێتی. بەڵام ئەو کتێبە کامەیە کە نووسەرەکەی خودی شەیتان خۆیەتی و دەشێ لەبەرگی کەسێك یاخود ناویکدا نووسیبێتی؟ ئەم پرسیارە ئۆقرە لە ناسخەکە هەڵدەگرێت و ئەو ساڵانەی لە تەمەن ماویەتی، تەرخانی دەکات بۆ گەڕان بەدوای ئەو کتێبەی شەیتان نووسیویەتی، کە دەشێت زۆر نهێنی تیادا پەنهان کرابێت. بەڵام ئەو دەبوو خاڵێك دیاری بکات تا لێیەوە هەنگاوبنێت و دەست بە گەڕان و پشکنین بکات. هەر بۆ ئەو مەبەستە لەخۆی دەپرسی: بڵێی جێ پەنجەی شەیتان لەسەر جوانی نەخشێنرابێت، یاخود هەموو شیعرێکی لەنگ و ناشرین کاری ئەوە؟ ئەو لەپشت هەموو ڕوون و ئاشکراییەکەوە وەستاوە، یاخود تەمومژ و ئاڵۆزی لە کاری ئەون؟ ئیدی ناسخەکە دەستنووس و پشت دێڕەکانیانی بۆ تارمایی و وێنەی شەیتان دەپشکنی، تا سەرئەنجام نهێنییەکەی دۆزییەوە و توانی تارمایی شەیتان لە پشت هەموو جوانییەکەوە بدۆزێتەوە، کە لە کتێبەکاندا هەیە، نەوەك ناشرینی. بەوەی هەموو بەرهەمهێنانێکی جوانی، ڕازی نەبوون و کوشتنی ئەو وێنەیەیە کە جیهان هەیەتی و ئەمەش لە دیدێکی شەیتانیانەوە سەرچاوە دەگرێت، بەوپێیەی فریشتەکان پارێزەری ئەو جوانییەن کە هەیە. کاتێك ناسخەکە گەیشتە ئەم دەرئەنجامە، هەوڵیدا بۆ خۆی ئەزمونی بکات و بیری لە نووسینی شیعرێك کردەوە، کە هەموو توانا و کارامەیی خۆی لە هونەری شیعر، تیا بەکاربهێنێت. ئەوەبوو چەند لە نووسینی شیعرەکەی دەچووە پێشەوە، ئەوەندە هەستی دەکرد تارمایی شەیتان لە پشتییەوە وەستاوە. چونکە هەموو خولقاندنێکی جوانی لەبەرانبەر ئەم جیهانەدا، کاری ڕۆحێکی ناڕازییە.

لەناکاو ماریا بەدەم باوێشکەوە قسەکەی پێبڕیم و وتی: واتا ناسخەکە خودی شەیتان خۆی دەبێت؟ وەك ئەوەی چاوەڕێی وەڵام نەکات، هەستا و بەرەو ژووری نووستنەکە ڕۆیشت. ماوەیەك بێدەنگ

دانیشتم و بیرم لـە قسـەکانی ولیـەم دەکـردەوە. پاشـان هەسـتام و ئـەو کاغـەزەم هێنـا، کـە پێـی دابـووم تـا لەژێـر گەرمایـی مۆمـدا نووسـینەکەی بخوێنمـەوە. ئەوەبـوو بینیـم کات و بـەروار و ناونیشـانێکی لەسـەر نووسـراوە.

ئیدی من زانیم دەبوو لەوکات و شوێنە سەیرەدا، ولیەم ببینم.

***

مریەم بەدەم لادانـی چەرچەفەکـەی سـەری و دایانـەوەی عەزیبیەکـەی، کە تا ناوقـەدی هەڵکشابوو، هەسـتاو بیـری لـەوە کـردەوە ئـەمڕۆ پێش بینینـی شێرزاد دەتوانێت سـەردانی ئـەو کتێبخانەیـە بـکات، کـە لە دەستنووسـەکەدا ولیـەم کاری لێـدەکات. پاشـان لەوێـوە دەتوانێـت شـوێن پێـی ڕووداوەکان هەڵبگرێت، وەک پێشـتر بیـری لێکردبـوەوە. هەربۆیـە بڕیاریـدا سـەعاتێک زووتر لە ماڵـەوە بچێتـە دەرەوە.

لە مەتبـەخ دوای ئـەوەی ویسـتی ئـاو گـەرم بـکات و قاوەیـەک بخواتـەوە، هەر زوو پەشیمان بوەوە و دوای ئـەوەی بـە بێزارییـەوە چـوو بـۆ تـەوالێـت، گەڕایـەوە و لاپەڕەیەکیتـری ڕۆمانەکـەی هەڵگرت و دەستی بـە خوێندنـەوەی کرد.

# نهێنی نازناو
# شێخ ڕەزا لە دەرەوەی یاساکەیە

ماریـا هەمیشــە وابــوو، لەنــاکاو بــۆ ماوەیــەك دیــار نەدەمـا و منیــش ڕاهاتبــووم لەســەر ئــەم ونبوونانــەی. ئــەو ئێوارەیــەش کــە دەرکەوتــەوە و وتــی: حــەزی لــە پیاســەیەکی کەنــاری دەریایــە، ڕۆژێــك بــوو بەفـر لەسـەرخۆ دەبـاری. هێـواش بـەلای مـراوی و تەورەسـەکاندا تێپەڕیـن، کـە ژنێکـی پیـر پارچـە نانـی بـۆ هەڵـدەدان و ئەوانیـش هاتبوونـە بـن شۆسـتەی پیادە ڕەوەکــەوە و هەریەکەیــان دەیویســت، لــەو وەرزی ســەرمایەدا، کــە بەفـر هەمـوو شـتیك دادەپۆشـێت و خـواردن کـەم دەبێتـەوە، فریـای گرتنـەوەی پارچـە نانێـك بکەوێـت. ژنـە پیرەکـەش بەخۆشـییەوە سـەیری دەکـردن و هەوڵیــدەدا هەرجــارە و یەکێکیــان پارچــە نانێــك بگرێتــەوە. دەشــێ ئــەوە گەورەتریـن ئـارەزووی ئـەو ژنـە بووبێـت لـەو ئێوارەیـەدا. من و ماریـا بێدەنگ لەژێـر چەترێکـدا دەڕۆیشـتین، تـا لەپەنـا دیوارێکـی نزمـدا وەسـتاین و بێدەنـگ لـە دەریامـان دەڕوانـی. سـەیری ماریـام کـرد، چاوەکانـی مانـدوو دیاربـوون. وتـم: ماریـا بیـر لەچـی دەکەیتـەوە؟ وتـی: لـەوەی ئیـدی مانـدوو بـووم لـە ماریـا. منیـش پێکەنیـم و وتـم دەکـرێ تـۆش ناوێکـی خـوازراو هەڵبژێریـت و ئیـدی بەناوێکیتـرەوە بژیـت. ماریـا پێنەکەنـی و تەنهـا بەچاوی مانـدووەوە دوور دەیڕوانـی. لەژێـر لێـوەوە وتـی: بەڕاسـت ئێمـە خۆمـان

یاخود ئەوە ناوەکانمانن، دەژین؟ بیرتە شەویك باسی ئەوەت کرد، هەموو شاعیرە کۆنەکانتان نازناویکیان بۆ خۆیان داناوە و شیعریان بەو ناوەوە نووسیوە. بەلام بۆت باس نەکردم بۆ وایان دەکرد؟ منیش وتم: کاتێك ئیسلام دێت، شیعر حەرام دەکات، بەوپێیەی خەیاڵ لە پشتییەوە وەستاوە و مرۆڤ دەتوانێت زیادەڕەوی لە وەسف و زەمدا بکات و تا ئەو سنوورە دنیاییانەش بڕوات، کە لەگەڵ بنەمای ئایینەکەدا ناکۆکن. بەلام ڕێگای لە شیعرێك نەگرت لە خزمەتی ئایینی ئیسلامدا بێت. هەربۆیە شاعیرەکان، ئەگەرچی لە حوجرەکانەوە هاتبوون، ڕێگایەکییان دۆزییەوە تا لەم تەڵەزگەیە دەربازیان بێت و لەبارەی شتە دونیاییەکانی وەك عەشق و جوانی و حەزەوە بدوێن، ئەویش بە دانانی نازناو بۆ خۆیان. وەك ئەوەی نازناوەکان بەجیا لە شاعیرەکان بژین و کەسانیتر بن. چونکە لە ئیسلامدا کاتێك مرۆڤ دەمرێت و لە دوای ناشتنی، لەسەر گۆڕەکەی سرووتێك ڕێکدەخرێت و مەلایەك بەیادی مردووەکەی دەهێنێتەوە ناوی چییە و کێیە. پاشان فێری دەکات لەو دونیا چی بڵێت و چۆن وەلامی فریشتەکان بداتەوە. بەلام لە دۆخی شاعیرەکاندا، ئەوان بەناوی خۆیانەوە دەمرن، نەوەك نازناوەکەیان. وەك ئەوەی نازناوەکەیان گوناهبار بێت، نەوەك خۆیان. دیارە لە مێژوویەکی دوور و درێژیشدا کەسانێکی دەگمەن هەبوون لەم بنەما شاراوەیە یاخی بوون و بێترس، بەناوی خۆیانەوە نووسیوویانە.

ماریا بەسەرسامییەوە سەیری کردم و وتی: بڵێی نازناوەکانیان دوای خۆشیان، هەر نەژین؟ منیش وتم: ئەمە تەنها ڕاڤەکردنێکە و هیچیتر. دوای قسەکانمان و لەژێر بارینی بەفردا، چ ئارەزوویەکی قوڵم بۆ لە ئامێزگرتن لە چاوە ماندووەکانی ماریادا خوێندەوە.

# نامەی دووەم
# نەتوانینی نووسین وەک پرۆژەیەک بۆ نووسین

هاوڕێم (ع.م)

هیوادارم باش بن

حەزمکرد لە ڕێگای ئەم نامەیەوە کەمێك لەبارەی کردەی نووسینەوە بۆت بنووسم. پێشتر باسی ئەو ئێوارەیەم بۆ کردیت، کە لەگەڵ ماریا لە کەناری دەریا و بەدەم بەفربارینەوە، لەبارەی هۆکاری هەڵگرتنی نازناو لای شاعیرەکان دوایـن. ئەوکاتە نەمتوانی بەدرێژی بۆت بنووسم، لەوانەیە ئەمە پەیوەندی بە شەرمەوە هەبێت و هەوڵمدابێت خۆم لە باسکردنی باوەش و ماچە قووڵەکانی ماریا لادابێت و نەمویستبێت باسی لەرزینی لێوی بکەم لەنێوان لێوەکانمدا و خشانی لەسەرخۆی زمانی بۆ ناوەدەمم. چۆن بەدەستێك چەترەکەم گرتبوو، دەستەکەی تریشم لەناو قژە خورماییەکەیدا بوو، ئەویش بەچاوی نووقاوەوە وەستابوو. لە ڕێگای گەڕانەوەدا، ماریا باسی ئەوەی بۆ کردم، کە وەك زۆر کەسیتر و لەپاڵ یاداشتی ڕۆژانەیدا، لە هەوڵی نووسینی ڕۆمانێکدایە، ئەگەرچی لەوانەیە ڕۆژێك نەتوانێت لەڕێگای خانەیەکی بڵاوکردنەوەوە چاپی بکات. بەڵام ماوەیەکە هەستدەکات هیچ توانای نووسینی نییە و هەرکاتێك بەنیازی نووسین دادەنیشێت، هەست بە پەرشوبڵاوی دەکات و

ناتوانێت خۆی کۆبکاتەوە. لەوکاتەدا بەدەم شان هەڵتەکاندنەوە وتی: لەوانەیە لە بنچینەدا، ئەم بۆ نووسین نەخولقابێت. حەزدەکەم لێرەدا ئەو گفتوگۆیەت بۆ بنووسمەوە، کە ئەو ئێوارەیە لەنێوانماندا ڕوویدا.

من زیاتر بۆ قسەکردن، نەوەك دڵدانەوەی ماریا، وتم: گرنگترین بڕیار بۆ نووسەر، بڕیاری دانیشتنە لەبەردەم مێزی نووسیندا. ساڵانێکی زۆر لەمەوبەر و لە چاوپێکەوتنێکی (جۆن ماکسوێل کۆیتزی)ی ڕۆماننووسی باشووری ئەفریقا و براوەی خەڵاتی نۆبڵی ٢٠٠٣دا، دێڕێکی ئاوام خوێندۆتەوە و زۆر سەرنجیڕاکێشاوم. بڕیاری دانیشتن لەبەرانبەر کاغەزی سپی و دەستبەرداربوونی زۆرێك لە خۆشییەکانی ژیان، سەخت ترین بڕیارە. چوونکە ئەو پێیوایە دواتر لە ململانێکردن لەگەڵ نووسیندا، لەگەڵ ڕەشکردنەوەی لاپەڕە و پاکنووسکردندا، نووسین خۆی بەدەستەوە دەدات. بەڵام ئەی ئەو ساتانەی هەست بە بێتوانایی و شکست دەکەین لەبەردەم سپێتی کاغەزدا؟ ئەو ساتانەی بڕیاردەدەین و دادەنیشین، لەبەردەممماندا پەڕەی سپی دادەنێین و قەڵەم بەدەستەوە دەگرین، بەڵام چەند لاپەڕەی سپی ڕەش بکەینەوە، پاکنووس بکەین و زیاد و کەم بکەین، هەستدەکەین ناتوانین زەفەر بە نووسین بەرین، هەروەك گۆرانی شاعیر لە ساتێکدا تووشی ئەو گرفتی بێ توانایی نووسینە دەبێت و هەر بە نووسینیش گوزارشت لەو دۆخە دەکات: (ئەو خەیاڵەی پێی مەستم، بۆم ناخرێتە ناو چوارچێوەی هەڵبەستم).

ماریا هیچی نەوت و تەنها بەسەر داخستنەوە ڕێی دەکرد. منیش درێژەم پێدا و وتم: (کارلۆس لیسکانۆ)ی ئۆرۆگوایی، کتێبێکی زۆر جوانی هەیە بەناوی (نووسەر و ئەوی دی)یەوە و لەبارەی ئەو ساتە ناخۆشەوەیە، کە تێیدا تووشی خەوزڕان و هەست بەفەشەل دەکات لە بەردەم نووسیندا. حەزدەکەم ڕۆژێك ئەو کتێبە بخوێنیتەوە. لیسکانۆ باس لە ساتێکی سەیر دەکات لەژیانی نووسەردا، ئەویش ئەوکاتەیە، نووسەر

ناتوانێت زەفەر بە نووسین بەرێت و لەبەردەم سپێتیی لاپەڕەدا، هەست بەبێ توانایی دەکات. چەند لاپەڕە ڕەش بکاتەوە و پاکنووس بکات، بەڵام ناتوانێت ئەوە بنووسێت، کە دەیەوێت یاخود لە خەیاڵیدایە. لەو کتێبەدا لیسکانۆ لەرێگای کۆمەڵێك بەشی کورت کورتەوە، دەیەوێت لەبارەی شتێکی سەیرەوە بدوێت، ئەویش ئەوەیە کاتێك نووسەر توانای نووسینی نامێنێت. کە دیارە ئەمە بەسەر لیسکانۆ خۆیدا هاتووە و کۆی کتێبەکەی وەك یاداشتێك وایە لەبارەی نەبوونی توانای نووسین"ەوە. کاتێك نووسەر دوور لە خۆشییەکانی ژیان، خۆی لەناو زماندا زیندانی دەکات، کەچی لەساتێکدا توانای تەواوکردنی ڕۆمانێکی نامێنێت. چەند خەریکی سڕینەوە، زیادکردن و پاکنووسە، بەڵام بێ سوود، توانای نووسینی نابێت. ئەمە بەسەر لیسکانۆ خۆی دێت و لەوساتەدا دەکەوێتە ڕامان و بیرکردنەوە لە ژیانی ڕابردووی، نووسین و ئەو بوونەوەرەی ناوەوەی، کە پێیدەوترێت نووسەر. هەربۆیە کتێبەکەی لە یاداشتێکی ڕۆژانە دەچێت لەبارەی نەبوونی توانای نووسینەوە. بەڵام لیسکانۆ ئەم دۆخەی تێیدەکەوێت، (جیاواز لە گۆرانی شاعیر، کە تەنها بە دێڕێك گوزارشتی لێ دەکات)، دەیکات بە کتێبێکی زۆر جوان و لە پشتییەوە دیدێکی سەیر سەبارەت بە نووسەر بینادەکات، ئەویش ئەوەیە نووسەر بونەوەرێکە دەخوڵقێنرێت. واتا مرۆڤ نووسەر لە خۆیدا دەخوڵقێنێت و نووسەر بوونێکی واقیعی و حەقیقی نییە. ئیدی پەیوەندییەکی سەیر لەنێوان نووسەر و خاوەنەکەی یاخود خوڵقێنەرەکەیدا دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە نووسەری داهێنراو، دەبێت بە ئاغا و خاوەنەکەشی دەبێت بە نۆکەری. چونکە مرۆڤ دەبێت کاربکات، تەماتە بکڕێت، پارەی کارەبا بدات، پلیتەی زۆپا بگۆڕێت، بچێت بۆ تەعزێ و کاروباری ژیانی ڕۆژانە ڕاپەڕێنێت و نووسەرەکەی ناویشی، وەك سەردارێك دانیشتووە و تەنها کاری نووسینە. مرۆڤ دەبێت بە خزمەتکاری نووسەرەکەی ناوی.

لە دیدی لیسکانۆوە، نووسەر بونەوەرێکە پێشتر بیری لێدەکەینەوە و ئامادەکاری بۆ دەکەین و دەیخولقێنین.

ماریا وتی: هیچ کتێبێکی ئەو نووسەرەم نەخوێندۆتەوە و ناویشیم نەبیستووە. منیش زیاتر درێژەم پێدا و وتم: کارلۆس لیسکانۆ نووسەرێکی بەناوبانگی ئۆرۆگواییە و ساڵی ١٩٤٩ لە مۆنتیفیدیۆ لەدایکبووە. لە گەنجێتیدا و دژ بە رژێمی دیکتاتۆریی وڵاتەکەی، پەیوەندی بە بزوتنەوەی تۆمبارۆی چەپی چەکدارییەوە دەکات و لە ١٩٧١ کاتێک تەمەنی ٢٢ ساڵ دەبێت، دەستگیر دەکرێت و دوای ئەشکەنجەدانێکی زۆر، ١٣ ساڵ لە زینداندا دەمێنێتەوە. زیندانی بوونەکەشی دەکاتە کتێبێک بەناوی (گالیسکەی شێتەکان - یاداشتی زیندان)، کە من بۆ خۆم سەرسام بووم بەو سادەییە جوانەی لەم کتێبەشیدا هەیە و لەبارەی زیندانییەکەیەوەیەتی.

لە زینداندا و لەدوای ساڵی هەشتەمەوە، دەست بە نووسین دەکات، (وەك خۆی دەڵێت) تا بەرگەی ئەو سەختییەی زیندان بگرێت و ورەی نەڕوخێت. پێدەچێت ئەوە، ئەو ساتە بێت کە لیسکانۆ لەناو خۆیدا نووسەرێك دەخولقێنێت. بەڵام لە زینداندا نووسین کارێکی ڕێگا پێدراو نەبووە، ناچار لەسەر هەر کاغەزێك نووسیویەتی، کە دەستی کەوتبێت و لە گیتاری هاوڕێیەکی زیندانییدا دەیانشارێتەوە، کە پێش ئەم بەردەدرێت. کاتێکیش لیسکانۆ ئازاد دەکرێت، گیتارەکە لە ماڵی خوشکەکەی دەبێت. ئیدی سەفەری لیسکانۆ لەگەڵ نووسیندا بەردەوام دەبێت و شانۆ، ڕۆمان، چیرۆك و شیعر دەنووسێت. دوای ئەوەی لە زیندان ئازاد دەکرێت، بەرەو سوید هەڵدێت و دە ساڵێکیش وەك پەنابەر لەو وڵاتە دەژی و دواتر دەگەڕێتەوە بۆ ئۆرۆگوای تا لەو پرسیارانە هەڵبێت، کە بەردەوام وەك غەریبێك سەبارەت بە ڕەگەز و خەڵکی کویی، لە پەناهەندە دەکرێن.

وتم: ماریا دەزانی بۆ من سەیربوو کاتێک لە کتێبی (نووسەر و ئەوی دی)ی لیسکانۆدا و لە لاپەڕە ٣١دا باسی شەوێك دەکات لە ستۆکهۆلم، کاتێک لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تورك و کورددا دەخۆنەوە و پێیان دەڵێت: دەتوانن بۆم باسبکەن چی کورد و تورك لەیەك پەرت دەکات؟ بۆ دەتوانن لێرە بەیەکەوە دابنیشن و گفتوگۆ بکەن، بەڵام لە تورکیا دژ بە یەکتر دەجەنگن؟ نازانم بۆ هەرگیز چاوەڕوانی دێڕێکی وا نەبووم لەم کتێبەدا، کە وای کرد دووجار ئەو چەند دێڕە بخوێنمەوە. ئەو لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی کورددا دادەنیشێت و دەماننناسێت، بەڵام ئێمە ئەو ناناسین.

لیسکانۆ لەسەرەتای کتێبەکەیدا نووسیویەتی: (ئەوە M بوو دایهێنام و لە تاریکییشدا دایهێنام). لە لاپەڕە ٣٣شدا دەنووسێت: هەستدەکەم من بینای کەسێتییەکم کردووە، کە کەسێتی نووسەرە. دەشزانم لە پشت ئەم کەسایەتییەوە هیچ شتێك بوونی نییە... خۆ ئەگەر ئەو ئارەزووەی لە دوانزە ساڵیدا هەمبوو بۆ بوون بە نووسەر، خوێندنەوەکانم و ئەو ساتانەی لە نووسین و ڕامان لە کردەی نووسین بەسەرم بردن، بسڕمەوە، ئەوا هیچ شتێکی نامێنێتەوە).

بەرانبەر ماریا وەستام و وتم: کاتێك کتێبەکەی لیسکانۆم دەخوێندەوە، شاعیرە کۆنەکانمانم بیردەهاتەوە، کە هەریەکە و نازناوێکی بۆ خۆی دادەنا. بیرم لەوە دەکردەوە بۆچی (خدر) نازناوی (نالی) و (مەلا محەمەد)یش نازناوی (مەحوی) بۆ شیعرەکانیان دادەنێن؟ ئایا نەیاندەتوانی بەناوی خۆیانەوە شیعر بنووسن و بەتوانای شیعرییان، لە کێش و سەروادا جێگایان بکەنەوە؟ یاخود نالی ناوی ئەو شاعیرەیە مەلا خدر لە خۆیدا دروستی دەکات؟ بەڵام مەحوی دووجار نووسەر لەخۆیدا دروست دەکات، ئەویش دوای (مەشوی)، کە دڵنیانین چی بەسەر هاتووە، مەحوی دروست دەکات.

وتم: ماریا ئـەو ناوانـەت دێتـەوە یـاد، کـە پێشـتر لەبارەیانـەوە قسـەم بۆ کردوویـت؟ دەزانیـت کاتێـك لـە خوێندنـەوەی ئـەو کتێبـەی لیسـکانۆ بوومـەوە، بەخۆمـم وت بەڕاسـت مـن چیـم خوێنـدەوە؟ ئەمـە کتێبـی یاداشـت بـوو لەبـارەی بیرکردنـەوە لـە نووسـین و نووسـەرەوە؟ یاخـود ڕامـان بوو لـەو شـتانەی پەیوەندییـان بـە نووسـینەوە هەیـە لای لیسـکانۆ؟ یاخـود ڕاسـتتر بڵێیـن بیرکردنـەوە و ڕامـان بـوو لەوسـاتانەی ناتوانیـن زەفـەر بـە نووسـین بەریـن و توشـی خـەوزڕان دەبیـن؟ بڵێـی ئەمـە سـیحر و نهێنیـی نووسـینی کارلـۆس لیسـکانۆ نەبێـت؟ ئـەو نووسـەرەی زینـدان نەخشـێکی زۆری لەسـەر ژیـان و بیرکردنـەوەی بەجێهێشـتووە، بێئـەوەی بکەوێتـە داوی زمانێکـی ئایدۆلـۆژی و بانگەشـەکارەوە.

وتـم: ماریـا دەشـێ ئـەم دۆخـەی نووسـەر تێـی دەکەوێـت و توانـای نووسـینی نامێنێـت، بەجۆرێـك پەیوەنـدی بـە (پەتـای بارتلیبیـی)ەوە هەبێت، کـە حەزدەکـەم لەماڵـەوە باسـی بکەیـن و لێگەڕێیـن ئێسـتا پیاسـەکەمان تەواوبکەیـن.

هەوڵدەدەم لەکاتێکیتردا باسی (پەتای بارتلیبی)ت بۆ بکەم.

***

# نامەی سێیەم
# نەنووسین وەک پەتای بارتلیبی

ئازیزم (ع.م)
پاش سلاو
لەم نامەیەدا حەزدەکەم لەبارەی شتێکی سەیرەوە بۆت بدوێم، کە پەیوەندی بە کردەی نووسینەوە هەیە و لەگەڵ ماریاشدا باسمان کرد. ئەویش وازهێنانە لە نووسین. لەوانەیە بزانیت ماوەیەك لەمەوبەر فیلیپ ڕۆثی ڕۆماننووسی ئەمریکی، دوای نزیکەی پەنجا ساڵ لە نووسین، بڕیاری وازهێنانی دا لە کاری نوۆسین. ئەو دوای پەنجا ساڵ لە کاری نووسین و نووسینی چەندین ڕۆمان، باس لەوە دەکات نووسین کارێکی زۆر سەخت و بەئازارە و لە ژیاندا زۆر شتی لێسەندۆتەوە. بۆ تێگەیشتن لەم بڕیارەی ڕۆث، باشترە ڕۆمانی (بارتلیبی و هاوڕێکانی)ی (ئەنریکە ڤیلا -ماتاس)ی ئیسپانی بخوێنینەوە، وەك بە ماریاشم وت.
لەسەرەتای ڕۆمانەکەی ڤیلا -ماتاسدا، ڕستەیەك بەناوی (ژان دو لا برۆییر ١٦٤٥-١٦٩٦)ەوە نووسراوە. بەڵام لە وەرگێڕانە عەرەبیپەکەیدا نووسراوە (جان دلا بروغییە)و پێدەچێت هەڵەی چاپ تێیدا ڕوویدابێت:
(شکۆ و شایەن بۆ هەندێك کەس پەیوەستە بە باش نووسینەوە، بەڵام بۆ هەندێکیتر، پەیوەستە بە نە -نووسینەوە).

دەکات، کە پەیوەندی بە نەنووسینەوە هەیە.

سەرەتا ئەو دوو دێڕە خوێنەر تووشی جۆرێک لە دڵەڕاوکێ دەکات، بەوەی بڵێی برۆییر ستایشی نەنووسین بکات؟ ئایا نەنووسین کردەیەکە و شایەنی ستایشە؟ بەڵام دواتر و هەر بە خوێندنەوەی چەند لاپەڕەیەک، تێدەگەین ڕۆمانی بارتلیبی و هاوڕێکانی، باسی بابەتێکی سەیر و ناوازە

ئەم ڕۆمانە باس لەو کەسانە دەکات، لە مێژووی ئەدەبدا بڕیاری دەستبەرداربوون لە نووسینیان داوە و بەیەکجاریماڵئاواییان لە دونیای نووسین کردووە. دیارە ڤیلا -ماتاس باس لە کەسێک ناکات، کە بەڕێکەوت هەندێک شت بنووسێت، پاشان ژیانی ڕۆژانە لەگەڵ خۆیدا بیبات. بەڵکوو ئەو باس لەو داهێنەرانە دەکات، کە قورسایی خۆیان هەیە لە دونیای نووسیندا، بەڵام لەساتێکدا دەستبەرداری نووسین دەبن.

دەبێت چ نهێنییەک لەپشت دەستبەرداربوون لە نووسین، وەستابێت؟ ئەی بڵێی خاڵی هاوبەش لەنێوان ئەو نووسەرانەدا هەبێت، کە دەکەونە دۆخی دوورکەوتنەوە لە نووسین؟ دۆخێک لە دونیای ئێمەدا، ناتۆرەی گاڵتەجاڕیانەی لێدەنرێت، وەک پێینەماوە (ئەمەش خوازەیەکی سێکسییە و بۆ پیاوان لە دوای تەمەنێکەوە بەکاردەهێنرێت)، یاخود لێچۆتەوە (دیارە ئەمەش لە دۆخی مریشکەوە وەرگیراوە کاتێک توانای هێلکەکردنی نامێنێت). بەڵام ڤیلا -ماتاس، ڕۆمانێکی ناوازە لەو دۆخە دەخولقێنێت.

***

ڤیلا -ماتاس لە ئێستادا بە یەکێک لە چوار ڕۆماننووسی گرنگی ئیسپانیا دادەنرێت و لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٨ە و ڕۆمانی (بارتلیبی و هاوڕێکانی) لە ٢٠٠٠دا بڵاوکردۆتەوە. لەو باوەڕەدام کاتێک خوێنەر

ناونیشانی ئەم ڕۆمانە دەبینێت، هیچ ڕانەوەستێت، بەوەی شتێکی وا سەرنجڕاکێشی تێدا نییە، مەگەر خوێنەرێکی بەئاگا خەیاڵی بۆ پەیوەندییەك بڕوات، کە لەنێوان ناونیشانی (بارتلیبی و هاوڕێکانی) و چیرۆکی (بارتلیبیی نووسەرەوە یاخود نەساخ)ی (هێرمان مێلفل)ی نووسەری (موبی دیك)دا هەیە و لەکاتی خوێندنەوەی ڕۆمانەکەدا، دەبینین ئاماژە بە چیرۆکەکەی مێلفل کراوە.

بارتلیبی ئەگەرچی ناوبانگێکی ئەوتۆی نییە لە دونیای ئێمەدا، بەڵام یەکێکە لە کەسایەتییە گرنگەکانی ئەدەب، هەروەك فاوست و هاملێت و مۆرسۆ و... (بارتلیبی) کەسایەتییەکی بەناوبانگی چیرۆکێکی هێرمان مێلفلی خاوەنی مۆبی دیکە و (زوینة آل تویة) کردوویەتی بە عەرەبی، (لە فارسیدا بە "بارتلبی محرر" وەرگێڕدراوە). بارتلیبی کەسایەتییەکی گۆشەگیر و دابڕاوە لە دونیا و هیچ ئامانجێکی نییە لە ژیانیدا، جگە لە ئامادەبوون لە شوێنی کارەکەی و کەسایەتییەکی بێدەنگە و هەموو شتێك ڕەتدەکاتەوە. ڤیلا -ماتاس ئەم کەسایەتییە ناوازەیەی مێلفلی وەرگرتووە، تا لە ڕێگایەوە بتوانێت باس لەو نووسەرانە بکات کە دۆخێکی بارتلیبییانەیان هەیە، یاخود لە ڕۆمانەکەدا وا باس دەکرێن کە تووشی (پەتای بارتلیبی) بوون. ئەگەر بارتلیبی کەسێك بێت لە جیهان پچڕابێت، ئەوا ڤیلا -ماتاس هاوشێوەکانی ئەم، لە دنیای نووسیندا دەدۆزێتەوە.

لەسەرەتای ڕۆمانەکەدا دەزانین، گێڕەرەوە ڕەبەنە و لە ٨ی تەممووزی ١٩٩٩دا دەست بە نووسینی یاداشت دەکات، کە لەهەمان کاتدا وەك پەراوێز وان بۆ ڕۆمانێك هێشتا نەنووسراوە، یاخود دەقێك کە بوونی نییە. ئەو پێش ٢٥ ساڵ ڕۆمانێکی سەبارەت بە مەحاڵیی خۆشەویستی بڵاوکردۆتەوە و دوای ئەوە وازی لە نووسین هێناوە و بووە بە کەسایەتییەکی بارتلیبییانە. وەك باسی دەکات، بارتلیبییەکان ئەو

کەسانەن جیهـان بەقوولـی ڕەفـز دەکەنـەوە. نـاوی بارتلیبیـش دەگەڕێتـەوە بۆ نـاوی فەرمانبەرێـك لـە چیرۆکـی (بارتلیبـی نەسـاخ یاخـود لەبەرگـرەوە)، کـە نەبینـراوە تەنانـەت ڕۆژنامەیەکیـش بخوێنێتـەوە، بـۆ مـاوەی درێـژ لـە پەنجـەرەوە، یاخـود دیـواری بەرانبـەری دەڕوانێـت. هەرگیـز نـە بیـرە یاخـود چا و قـاوەی نەخواردۆتـەوە، بـۆ هیـچ شـوێنێك نـاڕوات، چونکـە ئـەو ژیانـی لـە سنووری نووسـینگەی کارەکـەی دەرناچێـت و تەنانـەت ڕۆژانی پشـووش هـەر لـە شـوێنی کارەکـەی بەسـەر دەبـات. ئـەو باسـی هیـچ شـتێکی خـۆی نـاکات و کاتێکیـش پرسـیاری تایبەتـی، یاخـود داوای شـتێکی لێدەکرێـت، یاخـود لەبـارەی خۆیـەوە بدوێـت، هەمیشـە ڕسـتە بەناوبانگەکـەی دەڵێـت: پێـم باشـترە ئـەوە نەکـەم:

I WOULD PREFER NOT TO

بارتلیبـی تـا سـنوورێکی سـەیر داخـراوە بەسـەر خۆیـدا، بـەڵام زۆر جدییـە لـە کارەکەیـدا. تـا سـەرئەنجام ژیانـی زۆر تراژیدیانـە کۆتایـی پێدێت.

ڤیـلا -ماتـاس دەڵێـت: لەجیاتـی ئـەوەی بپرسـین: بـۆ ئـەوان لە نووسـین دەوەسـتن؟ دەبـێ پرسـیارەکە وا لێبکەیـن: بـۆ دەنووسـین و نووسـین چ سـوودێکی هەیـە؟ ئایـا نابێـت بژیـن و لەپێنـاو وشـەدا خۆمـان لـە ژیـان دانەبڕیـن؟

بارتلیبییـەکان لـە نووسـیندا ئەوانـەن ئیـدی ماڵئاوایـی لـە نووسـین دەکـەن، بـەڵام هـەر یەکـە و هـۆکاری خـۆی هەیـە و ڤیـلا -ماتاس بـەدوای هـۆکاری ئـەو وازهێنـان لـە نووسـینەدا دەڕوات. لـە ڕۆمانەکـەدا باسـی زۆر نووسـەر دەکرێـت، لەوانـە:

جـاك فاشـییە بـاوەڕی بـە گرنگـی نووسـین نامێنێـت و دەڵێـت: زۆر بـە سادەیی، هونـەر گەمژەییـە. دوای ئـەوە خـۆی دەکوژێـت. نەمانـی متمانـە بـە گرنگـی نووسـین، سـالنجەر تووشـی بێدەنگییەکـی سـەیر دەکات و ئیدی هیچ نانووسـێت. هـەروەك ئەنریکـە بانشـی ئەرجەنتینـی، دوای کتێبێکـی

سەرنجڕاکێش بەناوی (سندوقی دەنگدان)ەوە، ٣٥ساڵ بێدەنگ دەبێت. بەڵام (گۆردی لۆبیت) و (هۆفمانستال) لەبەر وشکبوونی خەیاڵیان واز لە نووسین دەهێنن. بەڵام (هۆلدەرلین) شێتی زەفەری پێدەبات و (والسەر)یش بیست ساڵی کۆتایی ژیانی لە شێتخانە بەسەر دەبات. لای (تۆماس دی کینزی) مادە هۆشبەرەکان هۆکارەکەیەتی. ئەوانەش هەن کە لەکاتی نووسیندا، تووشی ئاڵۆزی دەبن و نازانن چۆن دەقەکانیان بەرەو تەواوکردن بەرن، وەك (کالۆ ئەمیلۆ جادا) کە سەرەتای ڕۆمانەکانی زۆر باش دەبوون، بەڵام دواتر ئەوەندە پەلوپۆیان هاویشتووە، ناچار لە نووسین وەستاوە. بێدەنگ بوونی ڕامبۆ و خوان ڕۆلفۆ و...

ئایا بڵێی ساراماگۆش لە قۆناغێکی تەمەنیدا و دووجار تووشی ئەو پەتایە نەبووبێت، کە جارێکیان بیست ساڵ و جارەکەی تریش ١٠ساڵی خایاند و دواتر چاك نەبووبێتەوە لێی؟

دەزانی ئەگەر ڕۆژێك بیرم لە وەرگێڕانی ئەو ڕۆمانەی ڤیلا -ماتاس بکردایەتەوە، ئەوا وەك (حامد سەلیم)ی پاڵەوانی ڕۆمانی (المترجم الخائن)ی فەواز حەداد، بەجۆرێکیتر خیانەتم لە دەقەکە دەکرد و چەند لاپەڕەیەکم بۆ ڕۆمانەکە زیاد دەکرد. ئەویش سەبارەت بەو بێدەنگییە سەیرەی ئازاد سوبحی دەبوو، لە دنیای نووسینی ئێمەدا، یاخود نەنووسینەکەی خاوەنی دیوانی لە غوربەتا، بیرتە لە هەشتاکانی سەدەی بیستدا و لە باخی گشتی، دیوانە تاقانەکەیمان دەخوێندەوە؟ بەڕاستی دەکرێت ڕۆژێك لە دنیای خۆماندا بەدوای سەرچاوەی ئەم تۆرانە لە نووسین بگەڕێین. چوونکە دڵنیام ئەگەر ڤیلا -ماتاس بە ڕێگایەك شارەزایی لە ئەدەبی کوردیدا هەبووایە، ئەوە مەحاڵ بوو باسی بارتلیبییەکانی کوردی نەکردایە. لە ناسراوەکانییان ئەحمەد هەردی شاعیرە، کە لە دوای ئەو چەند شیعرەی دیوانی ڕازی تەنیایی پێکدەهێنن، ئیدی بێدەنگ بوو. هەرچۆن لە تەمەنێکی

زوودا و دوای دیوانی (لە غوربەتـا) نیشانەکانی ئەو پەتایەش لە محەمەد عومەر عوسماندا دیاری دەدات و لە ناوەڕاستی هەشتاکانەوە و دوای ئەو دیوانە، دڵنیا نیم یەك یاخود دوو شیعر دەنووسێت، کە بە دڵنیاییەوە یەکێکیان ژەنەراڵی پایزە. بەڵام هەرچۆن ڤیلا -ماتاس باسی ساراماگۆ ناکات، منیش باسی ئازاد سوبحیم نەدەکرد، کە دەیەوێت بێدەنگ بوون بکاتە تێکست.

بەڵام لەو باوەڕەدام دەستەی کتێبنووسە نهێنییەکان و نووسەری وەك (چەتەکانی خەیاڵ)، پێچەوانەی بارتلیبییەکان بن و ئەمان تووشی پەتایەکی دیکە بووبن. لەوانەیە (پەتای جۆرج سیمینون) ناوێکی گونجاو بێت بۆیان. ئەگەرچی وەختی خۆی یەك ڕۆمانی ئەو نووسەرە فەرەنسییەم خوێندۆتەوە، کە ئێستا بیرم نەماوە و من خوێنەری کارەکانی نیم، ئەوەندەی سەرسامم بەخۆی. بۆئەوەی سیمینون وەك پەتایەك نیشان بدەم، دەبێت هەندێك شتت بەیاد بهێنمەوە.

سیمینونی بەلجیکی -فەرەنسی نووس، بەوە بەناوبانگ بووە تەنها شەو دەستی لە نووسین وەستاوە. ئەو لە ١٩٠٣ لەدایکبووە و لە ١٩٨٩دا مردووە، لە تەمەنی نووسینیدا هەندێك دەڵێن ٤٥٠ ڕۆمان و نزیکەی سەد هەزار چیرۆکی نووسیوە. هەشن دەڵێن ئەو ٣٠٠ ڕۆمان و ٥٠٠ نۆڤلێتی نووسیوە. تەنها کەسایەتی (میگرێ)ی پشکنەر، لە ٧٥ ڕۆمانیدا ئامادەیی هەیە. لە ١٩٢٢ دەچێتە فەرەنسا و دوای دوو ساڵ یەکەم ڕۆمانی بەناوێکی خوازراوەوە بڵاودەکاتەوە و ئیدی بۆ ماوەی ١٠ساڵ، بە ١٨ ناوی خوازراوەوە دەنووسێت، تا لە ١٩٣٢دا ئەم نهێنییە ئاشکرا دەکات. کاتێك پرسیاری هۆکاری ئەو هەموو ناوە خوازراوەی لێدەکەن، دەڵێت: لەبەرئەوە بووە تا بتوانێت لەگەڵ چەندین خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەدا مامەڵە بکات. وەك مەزەندە دەکرێت سیمینون نزیکەی ٢٠٠ ڕۆمانی بەناوی خوازراوەوە بڵاوکردۆتەوە.

سیمینون لە نووسیندا زۆر خێرا بووە و هەر یەکسەر ڕەشنووسی ڕۆمانێکی تەواوەکرد و دوایی دەگەڕایەوە سەری و پاکنووسی دەکرد. ڕۆژانە لە شەشی بەیانییەوە بۆ شەشی ئێوارە، بەردەوام نووسیویەتی و توانیویەتی هەشتا لاپەڕە بنووسێت. ئەو ڕۆمانێکی دەهەزار دێڕیی، بە سێ ڕۆژ نووسیوە و جگە لە کورتە چیرۆك، مانگانە پێنج ڕۆمانی نووسیوە. لە ساڵی ١٩٢٧ بڵاوکەرەوەیەك لەسەر ٢٥هەزار فرەنك گرەوی لەگەڵ دەکات، ئەگەر بتوانێت بە سێ ڕۆژ ڕۆمانێك بەشێوەی زنجیرە بۆ ڕۆژنامەکەی بنووسێت، بەمەرجێك هەر ئەڵقەیەکی لە ماوەی سەعاتێکدا بنووسێت و لە قەفەزێکی شووشەشدا دابنیشێت تا هەمووان ببینن. سیمینون گرەوەکە دەباتەوە. ئەو شوێنێکی تایبەتی نەبوو بۆ نووسین، تەنانەت ئەگەر لە سەفەریشدا بوایە، تەنها پێویستی بە ئامێری چاپکردن و سکرتێرەکەی هەبووە.

دەشێ بپرسیت: سیمینون بۆ بەو وزە سیحرییەوە دەینووسی؟ دیارە ئەو خۆی نەیشاردۆتەوە کە باوکی ژمێریار بووە و خێزانێکی مامناوەند بوون، کاتێکیش باوکی دەمرێت، ئەم بەرپرسیاریی خێزانەکەیانی هەڵگرتووە و وازی لە خوێندن هێناوە و لە ڕۆژنامەنووسی گەڕۆکەوە دەستی بەکار کردووە، بەڵام خەونی ئەوە بووە ڕۆژێك دەوڵەمەند بێت. واش بوو، ئەو توانی لەڕێگای ڕۆمانەکانییەوە ببێتە ملیۆنێر و ٣٢ کۆشکی هەبێت.

بەڵام ئەم ئامێری ڕۆمانە، دوای ئەوەی ڕۆژێك نامەیەکی زەرد لەسەر مێزەکەی دەبینێت و لێی نووسراوە (ئۆسکار) ڕۆمانێك بەو ناوەوە دەنووسێت، کە دوایەمین ڕۆمانییەتی. چونکە لە ساڵی ١٩٧٢دا لە نووسین دەوەستێت و بڕیاردەدات هەرگیز نەگەڕێتەوە سەری. تەنانەت دەچێت بۆ شارەوانیی شاری لۆزان و شوناسنامەکەی دەگۆڕێت، بەوەی لە شوێنی پیشەدا نووسرابوو ڕۆماننووس، دەیکات بە بێ ئیش. ساڵێك

دوای ئـەوە یاداشـتەکانی خـۆی بـۆ مـاوەی نـۆ سـاڵ، لەسـەر کاسـێت دەگێڕێتـەوە، کـە ٢٠ موجەلـەدی گـەورە دەبێـت. بـەڵام دوای خۆکووشـتنی کچەکـەی، کـە سـیمینون یەکێـك بـووە لـە پاڵنەرەکانـی خۆکوشـتنەکەی، ژیانـی بەتـەواوی دەگۆڕێـت و هەرچـی هەیـە دەیفرۆشـێت و سامانەکەی تەخشان و پەخشـان دەکات و لـە خانوویەکـی بچووکـدا گۆشـەگیر دەبێـت و هیـچ چاوپێکەوتنێکیـش نـاکات. سـەرەتا ماریـا وا گومانـی دەکـرد، سـیمینونیش یەکێـك بووبێـت لـە دەسـتەی کتێبنووسـە نهێنییـەکان و دواتـر خـۆی ئاشـکرا کردبێـت. بـەڵام مـن لـەو باوەڕەدا نەبـووم، نـەك تەنها لەبەرئـەوەی خـۆی وتوویەتـی لەپێنـاو دەوڵەمەندبوونـدا دەنووسـێت، بەڵکـوو دەگمەنـە یەکێـك لـە دەسـتەی کتێبنووسـە نهێنییـەکان عاشـقی ئـەو ژمـارە زۆرە لـە خوێنـەر بووبێـت، بەڵکـوو ئـەوان کتێبـی یـەك نووسـخەیان لـە کتێبخانەکانـدا جێهێشـتووە.

دەکـرێ لـە کاتێکیتـردا، زیاتـر لەبـارەی نـاوی خـوازراو و خولیـای نووسـین لای دەسـتەی کتێبنووسـە نهێنییـەکان، بدوێـم.

***

مریـەم خۆشـی نەیزانـی بـۆ هەسـتا و بـەرەو کتێبەکانـی شـێرکۆ ڕۆیشـت و بە ناویانـدا گـەڕا، تـا هـەردوو کتێبـی (نووسـەر و ئـەوی دیکـە)ی کارلـۆس لیسکانۆ و (بارتلیبـی و هاوڕێکانـی)ی ئەنریکـە بیـلا-ماتاسـی دۆزییـەوە و لەگـەڵ سـەیرکردنیاندا، بەسەرسـامییەوە وتـی: وای خوایـە گیـان. وەک ئەوەی نهێنـی دەستنووسـەکە، زیاتـر و زیاتـر بـۆی ئاشـکرا ببێـت، ئەگەرچـی هیچی لەبـارەی شـێخ ڕەزاوە نەدۆزییـەوە. کتێبەکانـی لەسـەر مێـزی ژووری دانیشتنەکە دانـا و کەمێـک لێیـان وردبووەوە، پاشـان خستنییە نـاو جانتاکەی شانی و گەڕایـەوە بـۆ مەتبـەخ، چونکـە تـەواو هەسـتی بـە برسـێتی دەکـرد. بەدەم ئامادەکردنـی شـتێکەوە تـا بیخـوات، بیـری لـەو ناوانـە کـردەوە، کـە

لە دەستنووسەکەدا ڕێکەوتییان دەکات، بەوەی لەو پەڕەیەدا بینی بوونی، کە لەناو کتێب و کاغەزەکانی شێرکۆدا دۆزیبوویەوە. چوو دوو کتێبەکەی لە جانتاکەی دەرهێنایەوە، چونکە بیری لێکردەوە هیچ پێویست ناکات لەگەڵ خۆیدا بیانبات. لە جێگای ئەوە، بەشێکیتری لە دەستنووسەکە دانا، تا لە ڕێگا بیخوێنێتەوە. هەر ئەوکاتەش بڕیاریدا ماوەیەک زووتر لە مەوعیدەکەی شێرزاد بچێتە دەرەوە، تا سەردانی کتێبفرۆشییەکەی ولیەم بکات. بێئەوەی بزانێت، کە هەرگیز پێناخاتە ناو ئەو کتێبفرۆشییەوە.

مریەم وای دانابوو کەمێک زووتر لە مەوعیدەکەی شێرزاد بگاتە ناوەندی شار، ئەمەش بواری دەدا سەردانێکی خێرای کتێبفرۆشییەکەی ولیەم بکات و ئەگەر بۆشی گونجا، کەمێک قسەی لەگەڵدا بکات. بەڵام لەناکاو شەمەندەفەرەکە وەستا و ڕایگەیاند بەهۆی کێشەیەک لە هێڵەکەدا، ناچارن ماوەیەکی کەم بوەستن. ئەو ماوە کەمە نزیکەی چارەکە سەعاتێکی خایاند و مریەمیش بۆ زاڵبوون بەسەر بێزارییدا، خۆی بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەیەکەوە سەرقاڵکرد، کە لەسەر کورسییەکەی بەرانبەری جێ هێڵدرابوو، چونکە هەرچەند هەوڵیدا، نەیتوانی ئەو بەشە لە ڕۆمانەکە بخوێنێتەوە، کە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی. کاتێکیش شەمەندەفەرەکە کەوتەوە ڕێ و حسابی کاتەکەی کرد، زانی ئەگەر بچێت بۆ کتێبفرۆشییەکە و لەوێوە بگەڕێتەوە بۆ ئەو جێگایەی شێرزادی لێدەبینێت، ئەوا بەلای کەمەوە بیست خولەک دوا دەکەوێت. هەربۆیە ویستی تەلەفوون بۆ شێرزاد بکات و پێی ڕابگەیەنێت کەمێک دوادەکەوێت، لەوکاتەدا زانی مۆبایلەکەی بیرچووە و لەگەڵ خۆیدا نەیهێناوە. ئەمەش ناچاری کرد ئەو نەخشەیە هەڵبوەشێنێتەوە، کە لە خەیاڵی خۆیدا دایینابوو.

ئەگەرچی مریەم پێش کاتی یەکتربینینەکە گەیشتە سلوسن، بەڵام شێرزادی بینی ڕوو لە خۆر، لەسەر کورسییەک دانیشتووە و خەریکی خوێندنەوەیە.

کاتێک لەبەردەم شێرزاددا وەستا و سێبەرەکەی کەوتە سەری، شێرزاد لەسەرخۆ بەجۆرێک سەری هەڵبڕی، کە لە قاچییەوە بۆ ڕانی، پاشان عەزییە ڕەشە کورتەکەی سەیری کرد تا چاویان لەیەک ئالاّ و بزەیەکیان بۆ یەکتر کرد. شێرزاد هەستایە سەرپێ. مریەم دەستی درێژکرد و بەگەرمی سلاّوی لێکرد. پاشان بۆ ماوەیەک چاویلکە ڕەشە گەورەکەی خستە سەروو ناوچەوانی و بە پێکەنینەوە وتی: دەمێکە چاوەڕوانیت؟ شێرزادیش بەدەم ئاماژەکردنەوە بۆ ڕۆیشتن، وتی: نا، من خۆم زووتر هاتم، چونکە سەرم لە کتێبفرۆشییەکی دەستی دوو دا لە جادەی (درۆتنین گاتان)، کارەکەم لەوێ زوو تەواو کرد و دوای ئەوە هاتم بۆ ئێرە.

مریەم بە شڵەژاوییەوە وتی: ئەوەی ولیەم کاری لێدەکات؟ شێرزاد سەیرێکی کرد و وتی: بەڵێ، بۆ تۆش هاتوچۆی ئەوێ دەکەیت؟ مریەم بە خۆ دزینەوەیەکەوە وتی: جارجار.

بەڵام ئەو ڕێکەوتە ئاسان نەبوو بۆ مریەم، کە ئەگەر لە ڕێگا شەمەندەفەری ژێرزەوییەکە نەوەستایە، ئەوا لەوانە بوو لەو کتێبفرۆشییە ڕێکەوتی یەکترییان بکردایە، وەک چۆن ماریا لە دەستنووسەکەی شێرکۆدا... شێرزاد لەو بیرکردنەوانەی دەرهێنا، کاتێک لێی پرسی: حەزدەکەیت پیاسەیەکی قەراغ دەریا بکەین یاخود لە جێگایەک دابنیشین؟

مریەم وەک ئەوەی خەیاڵی لە شوێنێکیتر بێت، شانێکی هەڵتەکاند و وتی: هەرکامیان بێت، بەڵام وابزانم خۆرەکەی خۆشە و با جارێ پیاسە بکەین.

ئیدی بەرەو کەناری دەریاکە ڕۆیشتن، کە خەڵکێکی زۆر بە درێژایی ڕێگاکە لێی دانیشتبوون یاخود ڕاکشابوون و خۆیان دابووە دەم تیشکی خۆر.

مریەم پرسی: هیچت بۆ نەکرا لە کونسوڵخانەی عێراق؟

شێرزاد بە بێزارییەوە وتی: نا، وابزانم بۆشم چارەسەر ناکرێت، چونکە کاتی خۆی کە هاتووم، بە ناوێکی وەهمییەوە خۆم تەسلیم کردووە، نەوەک ناوە ئەسڵییەکەم.

مریەم بەپێکەنینەوە وتی: واتا تۆ ناوت شێرزاد نییە؟

شێرزادیش پێکەنی و وتی: نا، من ناوم شێرزادە و وەختی خۆی بەناوێکیترەوە خۆم تەسلیم کردووە. گرفتەکەش ئەوەیە مرۆڤ خۆی ناژی، بەڵکوو ئەوەی دەژی، ناوەکەیەتی.

مریەم بە سەرسامییەوە سەیری کرد و وتی: چۆن؟

مەبەستم ئەوەیە، شێرزاد ڕووە و بەلەمێک وەستا، کە دەیویست لە کەنارەکە دووربکەوێتەوە و بە هەمان هێمنییەوە درێژەی پێدا: ئێمەی مرۆڤ وا دەزانین ئەوەی دەژی، خۆمانین، لەکاتێکدا ناوەکانمان دەژی. بۆ نموونە کونسوڵخانەی عێراق من ناناسێت، چونکە هیچ ناوێکم نییە لای ئەوان و ناشیەوێت وەک شێرزاد بمناسێت. با نمونەیەکت بۆ بهێنمەوە، کاتێک تۆ ڕۆژنامەیەک دەخوێنیتەوە و هەواڵی کوژرانی کەسێکی نەناسراوی تیایە لە ئیسپانیا... بۆ نموونە... ناوی خافییرە، تۆ جگە لەو ناوە هیچیترت لا نییە و لە ڕێگای هەواڵەکەوە دەشێ فیگوری خافییر لە زەینی خۆتدا بخولقێنیت، بەڵام ئەوە هیچ پەیوەندی بە خافیریی ڕاستەقینەوە نییە. مەبەستم لەوەیە ئەوەی دەژی، ناوەکەیە نەوەک کەسەکە. دەشێ خافییر مردبێت، بەڵام ئەو لە تۆدا دەژی.

مریەم هەستی کرد بن باڵە تازە تاشراوەکانی کەمێک دەکزێنەوە، چاکەتە تەنکەکەی داکەند و لە ناوقەدی خۆی بەست، تەنها عەزییە ڕەشە کورت و بێقۆڵەکەی لەبەردا مایەوە، بەڵام ئەو لەوکاتەدا خەیاڵی لای ئەو بەشەی ڕۆمانەکەی شێرکۆ بوو، کە باسی لە ناو دەکرد. پاشان بۆئەوەی بابەتەکە بگۆڕێت، پرسی: ئەی چۆن بوو بڕیارتدا بمێنیتەوە؟

شێرزاد وەک ئەوەی چاوەڕوانی ئەو پرسیارە بێت، وتی: ئەوە بەسەرهاتی دوور و درێژە. مریەمیش بە پێکەنینەوە وتی: ڕۆژی ئەم وەرزەش درێژە. دوای ئەوە شێرزاد وتی: دوو هۆکار وای کرد بمێنمەوە، دووەمیان تۆیت.

مریەم ئەگەرچی وا خۆی نیشاندا، چاوەڕوانی ئەو وەڵامە نەبووە، بەڵام بەدەم قاقایەکەوە وتی: هەمووتان وا دەڵێن، ئەوەش ڕێگایەکی کورتە بۆ... قسەکەی تەواو نەکرد و وتی: ئەی هۆکاری یەکەم چی بوو؟ شێرزاد پێش ئەوەی وەڵامی بداتەوە، پێشنیاری ئەوەی بۆ کرد لە شوێنێک دابنیشن. هەر خۆشی ئاماژەی بۆ یەکێک لەو مێزە چۆڵانە کرد، کە لەبەردەم کافێیەکی بچوکدا بوو. دوای ئەوەی دانیشتن، وتی: بیرتە پێم وتیت من دوو کەسایەتیم هەیە و ئێستا تۆ لەگەڵ نووسەرەکەیاندایت؟ چەند مانگێک یاخود نزیکی ساڵێک دەبێت خەریکی نووسینی ڕۆمانێکم و هێشتا تەواوم نەکردووە. یەکەمجار کە تۆم بینی و وتت ناوم بەهارە، تووشی سەرسوڕمان بووم، بەوەی دیمەنی یەکتربینینێکی وا لە ڕۆمانەکەی منیشدا هەیە. لە دەستنووسەکەی منیشدا کچەکە دەڵێت ناوم بەهارە، بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە.

مریەم بە دەستی سێبەری بۆ چاوی کردبوو تا خۆرەکە ئەزیێتی چاوی نەدات، پرسی ئەی...؟

شێرزاد بێئەوەی سەیری بکات، وتی: لە ڕاستیدا ناوی مریەمە. هیوادارم تۆش ناوێکیتری وات نەبێت، چونکە ترسناکە واقیع و ڕۆمان تێکەڵ بەیەک ببن.

مریەم بە زۆر پێکەنینێکی کرد و لەگەڵیدا خۆی خست بە پشتدا و وتی چی... مریەم؟ ئەی هۆکاری یەکەم چی بوو وای کرد نەگەڕێیتەوە بۆ شارەکەی خۆت؟ خۆ ئەمەشیان هەر من نیم؟

شێرزاد بەدەم تێکدانی قاوەکەیەوە وتی: نا، ئەوە پەیوەندی بە دەستنووسی ڕۆمانەکەوە هەیە، بەوەی ڕووداوەکانی لەم شارەدا ڕوودەدەن.

هەرچەندە پێشتر ماوەیەک لەم شارەدا ژیاوم، بەڵام ئەمجارە حەزم کرد پیاسەیەک بە هەندێک لەو شوێنانەدا بکەم، کە لە ڕۆمانەکەمدا هەن. وەک پێم وتیت، پێش ئەوەی تۆ ببینم، چووم بۆ سەردانیی ئەو کتێبفرۆشییەی لە ڕۆمانەکەدا گرنگیەکی زۆری هەیە.

مریەم بە ساردییەکەوە وتی: ڕۆمانەکە باسی چی دەکات؟ شێرزادیش بە جۆرێک لە بێزارییەوە وتی: ناکرێت هەموو ئەمڕۆمان بە باسی ڕۆمان و سەفەرەکەی منەوە بکوژین، ئەوە دادەنێین بۆ کاتێکیتر. مریەمیش لەو ئاماژەیە تێگەیشت و هیچی نەوت.



ئێوارە دوای ئەوەی شێرزاد تا نزیک وێستگەی شەمەندەفەرەکەی گەیاند لە ناوەندی شار، مریەم بە تەنیا گەڕایەوە و بە درێژایی ڕێگاکە بیری لە شێرزاد دەکردەوە. تەنانەت کاتێک زەنگی تەلەفوونەکەی لێیدا و سەیری ژمارەکەی کرد، هیچ ئارەزووی وەڵامدانەوەی نەبوو. هەرچەندە ئەو وەک بەهار لەگەڵ شێرزاددا دانیشت، بەڵام هەستی دەکرد شتێک لە ناوەوەیدا دەگۆڕێت. بەدرێژایی ڕێگاکە و کاتێکیش گەیشتە ماڵەوە و لەسەر قەنەفەی هۆڵەکە دانیشت، بیری لە قسەکانی شێرزاد دەکردەوە و دەیویست ئەو قسانەی هەر پیاوێک لەبەردەم ئافرەتدا دەیکات تا سەرنجی ڕابکێشێت، لەو قسانەیتری جیابکاتەوە، کە هیچ ڕاڤەیەکی نەبوو بۆی. بەتایبەت ئەوەی پەیوەندی بە ڕۆمانەکەی شێرزاد و یەکتربینینەکەی یەکەمجاریانەوە هەبوو، پاشان ئەو قسانەی لەبارەی ناوەوە کردنی. ئەگەرچی ئەو ئێوارەیە شێرزاد لە میانەی قسەکانیدا، هەندێک شتی کەمی لەبارەی ژیانی خۆیەوە بۆ باس کرد، بەڵام مریەم هەستی دەکرد زۆر شت لەبارەیەوە دەزانیت. لەناکا و مریەم دەستی کەوتە سەر ڕانی، کە بەهۆی عەزییە کورتەکەیەوە بە دەرکەوتبوو،

هەستی بە جۆرێک لە پەشیمانی کرد لە پۆشینی ئەم جلانەیدا، کە پێشتر بیری لێنەکردبووەوە. چونکە نیگەران بوو لەوەی لەش و لاری وایان لە شێرزاد کردبێت... بەخۆی وت چییان لە شێرزاد کردبێت؟ خۆی دەیزانی وەڵامی پرسیارەکەی چییە، هەربۆیە لێیگەڕا و هەستا تا خۆی بگۆڕێت.

بەدەم خۆ گۆڕینەوە، ئەوەی سەیربوو بەلایەوە، ئەوەبوو بەدرێژایی ئەمڕۆ بیری لە شێرکۆ نەکردبووەوە، وەک ئەوەی شێرکۆ لە ڕابردوویەکی زۆر دووردا بێت. ئەگەرچی ئەوکاتەی شێرزاد داوەتی نان خواردنی ئێوارەی کرد و چوونە چێشتخانەیەکی لوبنانییەوە و شوێنێکیان لە گۆشەیەکیدا هەڵبژارد، مریەم سەرنجی دابوو هەڵسوکەوتی شێرزاد لەکاتی نانخواردندا، زۆر بە شێرکۆ دەکات.

مریەم دڵنیا بوو بەیانی شێرزاد دەبینێتەوە، وەک ئەویش لە کاتی قسەکانیدا ئاماژەی بەوەدابوو، تا باسی ڕۆمانەکەی بۆ بکات، هەربۆیە حەزی کرد بگەڕێتەوە سەر دەستنووسەکەی شێرکۆ و بزانێت ڕۆمانەکە بەکوێ دەگات. بەبێ ئەوەی بزانێت، لەبەر ماندوویێتی، دوای ئەوەی یەک بەشی لێدەخوێنێتەوە، خەوی لێدەکەوێت و ئیتر ئەوە دوا بەشیش دەبێت لە ڕۆمانەکە بیخوێنێتەوە.

# ڕاکردن لە با دا
## لەبارەی ئەدەبی بێتاقەتییەوە نادوێم

**نامەوێت لەم بەشەدا لەبارەی ئەو گفتوگۆیەوە بدوێم، کە شەوی پێش مەوعیدەکەم لەگەڵ ولییەم، لەنێوان من و ماریادا لەبارەی ئەدەبی بێتاقەتییەوە ڕوویدا.**

ئەو شەوە لە میانەی قسەکانمان لەبارەی ئەدەبەوە، دوای ئەوەی ماریا پرسیاری ئەوەی لێکردم، کە تا ئێستا هەوڵی نووسینم نەداوە؟ منیش بۆم ڕوون کردەوە، کە بیرۆکەی نووسینم هەیە و هەندێکجار تێبینییەك یاخود شتێك دەنووسم. بەڵام زیاتر ئارەزووم لەوەیە خوێنەر بم، وەك لەوەی ببمە نووسەر. چوونکە خوێنەر ئەو شتە دەخوێنێتەوە، کە ئارەزووی لێیەتی و دەیەوێت، بەڵام نووسەر تەنها ئەو شتە دەنووسێت، کە لە توانایدایە. ئەو قسەیەش مریەمی سەرسام کرد، منیش ناچاربووم درێژەی پێبدەم و وتم: دڵنیانیم قسەیەکی وام لە شوێنێکدا خوێندبێتەوە و کەسێك وای وتبێت، بەڵام بۆ خۆم باوەڕم پێیەتی و ئەمەش نهێنیی ئەو تەمەڵی و خۆ دزینەوەیەیە من لە بەرانبەر نووسیندا هەمە. خۆ ئەگەر ڕۆژێك نووسیم، ئەوا هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، هەست بە بۆشاییەك بکەم لە کتێبخانەکاندا و

دەفتەرێك هەبێت، نەنووسرابێت و مـن ناچاربـم بینووسـم، تـا ئـەو بۆشـاییە پڕبکەمـەوە. ئەگینـا بیـر لـە نووسـین ناکەمـەوە و دەمەوێـت هـەر خوێنەربـم. ماریا بـەدەم سەرسـامییەوە، وەك ئـەوەی خەیاڵـی لـە شـوێنێکیتر بێـت، پرسیارێکی سـەیری لێکـردم و وتـی: تـۆ چ جـۆرە ئەدەبێـك ناخوێنیتـەوە؟

منیـش وتـم ئـارەزووم لـە خوێندنـەوەی ئـەو دەقانـە نییە، کە هەسـت و سـۆز ڕۆڵ لـە نووسـینیاندا دەبینێـت. چونکـە هەسـت و سـۆز شـتێکی کاتیـن و زۆربـەی ئـەو دەقانـەش لـە وێسـتگەیەك یاخـود دۆخێکـی تەمەندا نووسـراون. بـۆ نموونـە زۆرجـار نووسـەر حـەز دەکات باسـی تەنیایـی یاخود بێتاقەتـی خـۆی بـکات. بـەڵام ئەوەنـدەی لـە سـنووری هەسـت و سـۆزدا بێـت، پەیوەنـدی بـە شـتێکی کاتییـەوە هەیـە و من حـەزم لـە خوێندنەوەی نییـە. هـەر لەبەرئەوەشـە ئـارەزووم لـە خوێندنـەوەی ئەدەبـی نامـە نییـە، کـە لەنێـوان نووسـەران و خۆشەویسـت، یاخـود کەسـە نزیکەکانیانـدا دەگۆڕدرێتـەوە. چونکـە گومـان دەکـەم زۆرێـك لـەو نامانـە بـەو هەسـتەوە نووسـرابن، کـە لـە ئاینـدە، یاخـود لـە پـاش مەرگییـان کۆبکرێنـەوە و بڵاوبکرێتـەوە. هەربۆیـە دەشـێ زۆرێکیـان بیانەوێـت وێنەیەکـی جـوان، یاخـود سـەیر بـدەن بەخۆیـان. هەربۆیـە هەسـتدەکەم ئـەو نامانـە جۆرێـك لـە فێڵکردنـی تێدایـە، ئەویـش لـە ڕێـگای ڕازاندنـەوە، یاخـود پیشـاندانی هەسـت و سـۆزێکی زۆرەوە، تـا لـە ڕێگایـەوە خوێنـەری پێسەرسـام بکـەن، وەك ئـەوەی لـە بنچینـەدا ئـەو نامانـە بـۆ خوێنـەر نووسـرابن. بـۆ خوێنەریـش زەحمەتـە لـەو نامانـەدا جیـاکاری لەنێـوان ڕاسـتی و درۆدا بکات. پاشـان ئـەم جـۆرە نووسـینە زۆر پەیوەنـدی بـە سـاتی دیاریکـراوەوە هەیـە و دەشـێت هـەر چەنـد خولەکێـك دوای نامەکـە، ئـەو کەسـە هەمـان هەسـت و ڕای نەبێـت، وەك لـە نامەکـەدا نووسـیویەتی (ئەگـەر وامـان دانـا، ئـەو ڕاسـتگۆ بـووە لـەوەی نووسـیویەتی). ئەمـەش تـا ڕادەیـەك بـۆ نووسـینەوەی ئـەو جـۆرە لـە یاداشـتیش ڕاسـتە، کـە لەتەمەنێکـدا

دەگەڕێینەوە سەر ڕابردوومان و بە خەیاڵ و دیدگای گەورەییمانەوە باس لە شتەکانی ڕابردوومان دەکەین. بۆ نموونە کاتێك نووسەرێك باس لە منداڵیی خۆی دەکات، هەوڵدەدات وێنەی منداڵێکی نائاسایی بۆ خۆی دروستبکات، کە هەر لەوکاتەوە تۆوی بلیمەتێکی لەخۆیدا هەڵگرتووە، یاخود وێنەی قوربانییەك لەخۆیدا دروست دەکات. دەشێ ئەم قسانە بۆ کولتووری من ڕاست بێت، بەوپێیەی ئێمە ئەوەندەی دەمانەوێت وێنەی کەسێکی نامۆ و نائاسایی، کە ڕۆحی فریشتەیەکی لەخۆیدا هەڵگرتووە و لە خەیاڵماندایە، بۆ خۆمان بکێشین، ئەوەندە هەوڵی نووسینەوەی خۆمان نادەین وەك ئەوەی هەین. بۆ نموونە ئەگەر لە دونیای ئێمەدا هەموو سیاسییەکان یاداشت بنووسنەوە، ئەوا هیچ تاوانبار، خائین، هەتیوباز و خراپەکارێك نابینینەوە. چونکە هەموومان هەوڵدەدەین وێنەیەکی جوان، یاخود وێنەی شۆڕشگێڕێکی پاڵەوان بۆ خۆمان بکێشین. ئەمەش وام لێدەکات ئەو جۆرە ئەدەبە نەخوێنمەوە. بەڵام دەشێ لە ئایندەدا ئەو جورئەتی ڕاستگۆییەمان هەبێت و باسی ڕووە نهێنی و شاردراوەکەی خۆمان بکەین و دان بە ناشرینیی خۆماندا بنێین. بەڵام تا ئێستا ئێمە لە نووسینەوەی خۆماندا، هەر بەدوای وێنەی فریشتەیەکدا وێڵین. بە پێکەنینەوە وتم: لای ئێمە ناتوانین قسە لە نهێنییەکانی ژیانمان بکەین و ئەوەش بۆ خۆی نهێنییەکە.

ماریا بێدەنگ و سەرسامانە سەیری دەکردم. منیش بەردەوام بووم و وتم: جۆرە نووسینێك لە دونیای ئێمەدا بڵاوە، ئەگەر بگونجێت، ئەوا پێی دەڵێم (ئەدەبی بێتاقەتی)، من توانای خوێندنەوەی ئەو جۆرە نووسینەشم نییە.

ماریا پێکەنی و وتی: ناوێکی سەیرە، ئەگەرچی من لە مەبەستەکەت تێناگەم، بەڵام بێتاقەتبوون دۆخێکی ئینسانییە. مرۆڤ چۆن دەتوانێت

لەبارەی خۆشەویستی و سێکسەوە بنووسێت، هەروا‌ش دەتوانێت لەبارەی بێتاقەتی خۆیەوە بنووسێت. وانییە؟ وتم: ڕاستە... بەڵام جیاوازییەك هەیە لەگەڵ ئەوەی من باسی دەكەم. چونكە جۆرێك لە نووسین هەیە من ناتوانم بیخوێنمەوە، بەوەی نووسەرەكەی بۆ ئەوە نووسیویەتی تا پێم بڵێت بێتاقەتە، بێزار و تەنیایە. یاخود بێ هۆ جنێو بە ژیان، ئەوانیتر و كۆمەڵگا دەدات وەك ئەوەی تاوانێكی لێكرابێت و ناز بەسەر ئەوانیتردا دەكات، كە دەژی و بەردەوامیی بە ژیانی خۆی دەدات، وەك ئەوەی ئەوانیتر بەرپرس بن لە ژیانی ئەم. پاشان ئەو جۆرە ئەدەبە، ئەدەبێكی ساتەوەختییە. بەوەی لە تەمەنێكی دیاریكراودا دەنووسرێت. ئایا تەنها باسكردن و خستنەڕووی ئەوەی كە ڕەشبینین و قسە بە ژیان بڵێین وەك ئەوەی غەدری لێكردبین، بەسە بۆئەوەی دەقێك دروست بكات، توانای خوێندنەوەیمان هەبێت؟ ئەی چی بەو مرۆڤە دەست و قاچ پەڕیوە بڵێین، كە ململانێ لەگەڵ ژیاندا دەكات. یاخود ئەو بێوەژنە تەنیایەی لە غەمی بەخێوكردنی چوار منداڵەكەیدایە؟ لە دنیای ئێمەدا ئەم جۆرە نووسینە زۆرە، كە نووسینێكی كاتییە و بە ئیحساسەوە لە دونیا دەڕوانێت. من توانای خوێندنەوەی ئەو جۆرە ئەدەبەشم نییە.

ماریا كەمێك دەموچاوی گرژ كردبوو، وەك ئەوەی بیر لە شتێك بكاتەوە. بە دەنگێكی نزم وتی: من نموونەیەكی ئەو جۆرە ئەدەبەم لە خەیاڵدا نییە، هەربۆیە وێناكردنی زەحمەتە بۆم. منیش وتم: ماریا دەشێ وێناكردنی ئەمە بۆ تۆ كەمێك زەحمەت بێت، بەڵام لە دونیاكەی مندا ئەم جۆرە نووسینە زۆرە. تۆ بیهێنەرە بەرچاوت، دەقێك بە درێژایی دێڕ و لاپەڕەكانی تەنها بڵێ ژیان بێ تام و هیچە و نووسەرەكەی بە ڕۆحێكی مازۆخییەوە خۆی ئازار بدات و هەست بەوە بكات ژیان زاڵم و غەدداره بەرانبەری.

ماریا بە پێکەنینەوە وتی: بێ مانابوونی ژیانیش پێویستی بە جۆرێك لە ڕاڤە و سەلماندن هەیە، ئەویش لە ڕێگای پرسیارەوە. ئەگینا ئەو کەسە دەبێت چارەسەری دەروون بکات. بیرمان نەچێت مرۆڤ بە سرووشتی خۆی، بوونەوەرێکی ڕەشبینە و دەکرێ مێژوو وەك ڕووبەری ململانێی نێوان ئومێد و ڕەشبینی ببینین. دەشێ منیش بارودۆخێکی دەروونی تایبەت یاخود هەندێك پرسیار و گرفتم هەبێت لەبەرانبەر ژیاندا و وا بکات بە شێوازێکی جیاواز لەوانیتر بژیم و بیربکەمەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە ئەم شتانە مەرج بێت ببن بە دەق. پاشان ڕازی بم بەوەی لە ئینسان کەمتر بژیم و مل بۆ واقیع بدەم، یاخود ڕازی بم ئەوانیتر بەزەییان پێمدا بێتەوە. چونکە ئەوەی پێی دەڵێین واقیع و ئێمە تیایدا دەژین، دروستکراوی ئینسانەکان خۆیانە. من باس لە گەشبینی ناکەم، بەڵام ئەگەر ئێستا ئێمە دوو کۆیلە بووینایە و دوای ڕۆژێکی پڕ لە کاری تاقەت پرووکێن، لە کێڵگەیەکی لۆکە یاخود کانێکی مسدا، تەنها ئەوە بەس بوو بمانووتایە ژیان بێمانایە؟ یاخود ملکەچانە چاوەڕێی مردنمان بکردایە؟ چونکە من ناتوانم چاوەڕێی موعجیزەیەك بم، تا ژیانمان جوان بکات. ژیان یاری لۆتۆ نییە.

ئەو شەوە باسی ئەوەمان کرد، کە مرۆڤ بۆ خۆی بوونەوەرێکی ڕەشبینە، بەڵام ئومێد و خەونەکان دروست دەکرێن و ڕەشبینیش مانای ئەوە نییە ڕازی بین بەوەی واقیع چۆنە، ئاوا ملکەچی بین بژین، یاخود بەناوی ڕەشبینییەوە ڕازی بین بەوەی کەمتر لە مرۆڤ سەیر بکرێین. پاشان ئەوە وەهمێکی کوشندەیە پێمان وا بێت ژیان دوو جەمسەری هەیە: لایەکییان ڕەشبینییە و ئەویتریشیان گەشبینییە. لەکاتێکدا لەنێوان ئەم دوو جەمسەرەدا، ڕووبەرێکی فراوان هەیە و نووسین کاری تیا دەکات. دەشێ بنووسیت، بێئەوەی س

بە دەستەی رەشبین، یاخود گەشبینان بیت. من باسی ئەزموونێکی خۆمم سەبارەت بە ڕازیبوون و ملدان بە ژیان بۆ کرد و نموونەی ئەو شەوەی زیندانی ئەدرنەم بۆ هێنایەوە، کە لەسەر سنووری تورکیا/ یۆنان زیندانی بووم و دوای ئەوەی ڕێگایەکمان بۆ هەڵهاتن دۆزییەوە، من نەمتوانی لەگەڵ زیندانییەکانیتر هەڵبێم، چونکە من وەك ئەو ئەسپە تەسلیمی قەدەری خۆم ببووم، کە توانای بازێکی کورتی بەسەر پەرژینە نزمەکەی دەوریدا نییە.

باسکردنی گفتوگۆی ئەو شەوە لەبارەی ئەدەبی بێتاقەتییەوە هەڵدەگرم بۆ کاتێکیتر، تا بەوردی بینووسمەوە. بەڵام بیرتە جارێك باسی نووسەرێکی شیلیم بۆ کردیت بەناوی رۆبەرتۆ بۆلانیۆوە؟ حەزدەکەم لێرەدا بەشێکی کورت لە ڕۆمانی (پشکنەرە کێوییەکان) لە لاپەڕە ٢٤١و ٢٤٢ت بۆ بنووسمەوە، کە لەبارەی ئەدەبی بێئومێدییەوەیە، کە دیارە هەرچۆنێك بێت، باڵاترە لەو ئەدەبەی من پێیدەڵێم ئەدەبی بێتاقەتی:

*خواکین. فۆنت، نەخۆشخانەی. ئەل ڕێپۆسو بۆ نەخۆشییە عەقلییەکان، باخچەی دێل دیسپیرتۆ دی لوس لیۆنتیسی نیشتمانیی، قەراغ شاری مەکسیکۆ، تەمموزی ١٩٧٧:*

*کتێب هەیە بۆ کاتی وەڕسی. لەمەش زۆر هەیە. کتێبیش هەیە بۆ ئەو کەسەی ئارامیی دۆزیوەتەوە. بە بۆچوونی من، ئەمە باشترینە. هەروەها کتێبیش هەیە بۆ ئەو کاتە دەگونجێت، مرۆڤ غەمبارە. کتێبیش هەیە بۆ ئەوکاتە دەگونجێت، مرۆڤ بەختەوەرە. کتێبیش هەیە بۆ ئەو کەسەی تینووە بەدوای مەعریفەدا. هەروەها کتێبیش هەیە بۆ ئەو کەسەی مەیئوسە. ئەمەش ئەوە بوو، (ئۆلیسیس لیما) و (بیلانۆ) دەیانووویست بینووسن. ئەوان خواپ بەهەڵەدا چووبوون، هەرچۆن لە ئایندەدا دەردەکەویت. با خوێنەرێکی مامناوەند بە نموونە*

وەربگرین. کەسێکی هێمن، لاوێکی تێگەیشتووی خوو ڕەوشت جوان و پەسەند، زرنگ. کەسێك کتێب و گۆڤارە ئەدەبییەکان دەکڕێت. ئەو کەسە چۆن دەبینن؟ کەسێکی ئاوا دەتوانێت ئەوە بخوێنێتەوە، کە بۆ کەسێکی ئارام و هوشیار نووسراوە. بەڵام دەشتوانێت جۆرەکانیتری کتێب بخوێنێتەوە، بە چاوێکی ڕەخنەگرانەوە، بێئەوەی بە شێوەیەکی نابەجێ و مەرگەساتانە بکەوێتە ژێر کاریگەرییان، ئەو دەتوانێت بێ لایەنانە بیانخوێنێتەوە. ئەمە باوەڕی منە. من نامەوێت کەس بریندار بکەم. با ئێستا خوێنەرە مەیئوسەکە وەربگرین، ئەوەی کە نووسەرە بێئومێدەکان دەڵێن کە ئەوان ڕوویان تێدەکەن. ئێوە چی دەبینن؟ یەکەم: ئەمە پەیوەستە بە هەرزەکارێك، یاخود کەسێکی گەورەی ناکامڵەوە، مرۆڤێکی نیگەران و ترسنۆك. ئەم گەمژە نموونەییە (ببورن بۆ دەربڕینەکە) دوای خوێندنەوەی (ئازارەکانی ڤارتەر) خۆی دەکوژێت. دووەم: ئەو خوێنەرێکی سنووردارە. بۆچی ئەو سنووردارە؟ ئاسانە، چونکە ئەو تەنها دەتوانێت کتێبی نائومێدانە یاخود ئەو کتێبەی بۆ نائومێدییە، بخوێنێتەوە. لە پەیوەست بەمەوە ئەو هەرگیز ناتوانێت، بۆ نموونە، بێ پچڕان (گەڕان بەدوای کاتی بەسەرچوودا) بخوێنێتەوە. یاخود چیای جادوویی (بەپێی دیدی من، نموونەی بالایە بۆ کتێبی هێمنی، مەتینی، ناوازەیی)، یاخود (بێنەوایان)، یاخود (جەنگ و ئاشتی). ئایا بۆچوونی خۆم ڕوونکردەوە؟ باشە، بۆچوونی خۆم ڕوون کردەوە. ئیدی قسەم لەگەڵ (لیما و بیلانۆ)دا کرد، ئەوەم پێ وتن، ئاگادارم کردنەوە، داوام لێ کردن بیربکەنەوە چ ڕیسکێك دەکەن. وەك ئەوە وابوو قسە بۆ دیوار بکەیت. سەرەڕای ئەوەش وتم خوێنەرانی نائومێد، وەك کانە ئاڵتوونەکانی کالیفۆرنیان، ڕۆژێك تەواو دەبن! بۆچی؟ ئەمە شتێکی ئاشکرایە. کەس ناتوانێت تەواوی ژیانی مەیئوس بژی، جەستە توانای نییە، ئازارەکەی بەرگە ناگیرێت، ئیدی وردە وردە،

هۆشی لە سێلاوی سارددا ون دەبێت. خوێنەری مەیئوس (بەتایبەت ئەوەی شیعری نائومێدانە دەخوێنێتەوە، باوەڕم پێبکە، تەحەمول ناکرێت) سەرئەنجام واز لەوە دەهێنێت گوێ بە کتێب بدات و بەگشتی دەبێت بە هیوابڕاوێکی تەواو. یاخود چاك دەبێتەوە. وەك شەکەتێك لە پرۆسەی چاکبوونەوەدا، لە لۆکە پێچراوێك، لە ڕێژنەیەك حەپی ئارامکەرەوەی تواوەدا، ئەو دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو ئەدەبەی کە بۆ خوێنەرێکی ئارام، سەرحاڵ، پڕ ئاسوودە نووسراوە. ئەمەش پێی دەوترێت (یاخود وەك من پێی دەڵێم): گوزەر لە قۆناغی هەرزەکارییەوە بۆ باڵقی. مەبەستیشم ئەوە نییە بڵێم کاتێك مرۆڤ بووە خوێنەرێکی ئارام، ئیدی کتێبی نائومێدی ناخوێنێتەوە. بەدڵنیاییەوە وا دەکات! بەتایبەت ئەگەر کتێبی بەباش، یاخود پەسەندبن، یاخود هاوڕێیەك پێشنیازیان بکات. بەڵام لە قوڵاییدا ئەوانە مرۆ وەڕس دەکەن! ئەم جۆرە ئەدەبە بەخۆی و هەموو چەقۆ و فیگۆری مەسیحەکانییەوە ناگاتە هیچ دڵێك، بە هەمان شێوەی لاپەڕەیەکی ئارام و سەنگین... ئەمەم بە لیما و بیلانۆ وت! ئاگادارمکردنەوە! ئەدەبی ڕاستەقینەم نیشاندان. مەترسییەکانم نیشاندان... وتم نابێت ئێوە ئاوا زیادەڕۆیی بکەن، دەمارەکانتان تا دوا دڵۆپ بەتاڵ بکەنەوە. خاکی بن! بگەڕێن، لە زەوییە نەزانراوەکاندا ون بن، بەڵام کاتێك دەڕۆن با گوریسێکتان گرتبێت، شوێنەوارێکی کەم بەجێبهێڵن یاخود بەردی سپی، کە بتوانن ڕێگای گەڕانەوە بدۆزنەوە!

***

ئێوارەیەکی سارد بوو، کاتێك بەرەو ئەو شوێنە چووم، کە دەبوو ولیەمی لێببینم. ئەو ڕۆژە لەماڵەوە مامەوە و نەچوومە دەرەوە. لەدوای نیوەڕۆوە جۆرێك لە نیگەرانی گرتبوومی، بەوەی بۆچی ولیەم کاتێکی

هۆشی لە سێلاوی سارددا ون دەبێت. خوێنەری مەیئوس (بەتایبەت ئەوەی شیعری نائومێدانە دەخوێنێتەوە، باوەڕم پێبکە، تەحەمموول ناکرێت) سەرئەنجام واز لەوە دەهێنێت گوێ بە کتێب بدات و بەگشتی دەبێت بە هیوابڕاوێکی تەواو. یاخود چاك دەبێتەوە. وەك شەکەتێك لە پرۆسەی چاکبوونەوەدا، لە لۆکە پێچراوێك، لە ڕێژنەیەك حەپی ئارامکەرەوەی تەواوەدا، ئەو دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەو ئەدەبەی کە بۆ خوێنەرێکی ئارام، سەرحاڵ، پڕ ئاسوودە نووسراوە. ئەمەش پێی دەوترێت (یاخود وەك من پێی دەڵێم): گوزەر لە قۆناغی هەرزەکارییەوە بۆ باڵغی. مەبەستیشم ئەوە نییە بڵێم کاتێك مرۆڤ بووە خوێنەرێکی ئارام، ئیدی کتێبی نائومێدی ناخوێنێتەوە. بەدڵنیاییەوە وا دەکات! بەتایبەت ئەگەر کتێبی باش، یاخود پەسەندبن، یاخود هاوڕێیەك پێشنیازیان بکات. بەڵام لە قووڵاییدا ئەوانە مرۆ وەڕس دەکەن! ئەم جۆرە ئەدەبە بەخۆی و هەموو چەقۆ و فیگۆری مەسیحەکانییەوە ناگاتە هیچ دڵێك، بە هەمان شێوەی لاپەڕەیەکی ئارام و سەنگین... ئەمەم بە لیما و بیلانۆ وت! ئاگادارمکردنەوە! ئەدەبی ڕاستەقینەم نیشاندان. مەترسییەکانم نیشاندان... وتم نابێت ئێوە ئاوا زیادەڕۆیی بکەن، دەمارەکانتان تا دوا دڵۆپ بەتاڵ بکەنەوە. خاکی بن! بگەڕێن، لە زەوییە نەزانراوەکاندا ون بن، بەڵام کاتێك دەڕۆن با گوریسێکتان گرتبێت، شوێنەوارێکی کەم بەجێبهێڵن یاخود بەردی سپی، کە بتوانن ڕێگای گەڕانەوە بدۆزنەوە!

***

ئێوارەیەکی سارد بوو، کاتێك بەرەو ئەو شوێنە چووم، کە دەبوو ولیەمی لێببینم. ئەو ڕۆژە لەماڵەوە مامەوە و نەچوومە دەرەوە. لەدوای نیوەڕۆوە جۆرێك لە نیگەرانی گرتبوومی، بەوەی بۆچی ولیەم کاتێکی

درەنگی لە جێگایەکی دوور و چەپەك دانابوو بۆ یەکتربینینەکەمان؟ کە دەکەوتە شوێنێکی چۆڵ لە دەرەوەی ویستگەی شەمەندەفەری گەرەکی ئوپلاندس ڤێسپی لە باکووری شاری ستۆکهۆڵم. ئەو ئێوارەیە هەوا زۆر ساردبوو، بە ناچاری و لەتاو سەرما، لەکەنار جادە چۆڵەکە پیاسەم دەکرد، تا لەناکاو ئۆتۆمبیلێك وەستا و لەبەر تاریکی، نەمتوانی شۆفێرەکەی ببینم. بەڵام بەدەنگەکەیدا زانیم ولیەمە، کاتێك وتی سەرکەوە. بێئەوەی هیچ بڵێم، سەرکەوتم و سەیری تاریکییەکەی پێشەوەم دەکرد. ولیەمیش بێدەنگ، چاوی لە پێشەوە بڕی بوو. جارجاریش بەهۆی ئاوێنەکەی بەردەمییەوە، چاودێریی ڕێگاکەی پشتەوەمانی دەکرد، ئەگەرچی هیچ ئۆتۆبیلێکی پێدا نەدەڕۆیشت.

ماوەی نیو کاتژمێر بە ڕێگایەکی چۆڵ و باریکدا ڕۆیشتین و جگە لە چەند پرسیار و قسەیەکی ئاسایی، هیچمان لەگەڵ یەکتردا نەوت. دوای ئەوەی لاماندایە ڕێگایەکی خۆڵ و بۆ ماوەیەکی کەم لە ڕۆیشتن بەردەوام بووین، ولیەم بێ ئەوەی سەیرم بکات، وتی: دەبێت ماوەیەك بە پێ بڕۆین. ئۆتۆمبیلەکەی ڕاگرت و کەمێك بە نارەحەتی دابەزی. دوای ئەوەی خۆمان پێچایەوە، ولیەم جانتایەکی بچووکی ڕەشی کردە شانی و بە تولە ڕێیەکدا بەناو دارەکاندا کەوتە ڕێ. منیش بێدەنگ دوای کەوتم. بێئەوەی بزانم خانوویەکی بچووك چاوەڕێم دەکات، کە نهێنی کتێبنووسە نادیارەکانی تێدا دەدۆزمەوە.

پێدەچوو خانووە چۆڵەکە لەناو ئەو دارستانەدا، یەکێك بێت لە ماڵە هاوینەییەکان و کەلوپەلێکی سادەی تێدابوو. دوای ئەوەی ولیەم دوو مۆمی داگیرساند، لە پەنجەرەکەوە سەیری حەوشەی دەرەوەی کرد و چوو ئاگردانەکەی گرداد. من تا ئەوکاتە لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستابووم و لەبەر ڕووناکیی کزی مۆمەکان، سەیری تابلۆی سەر دیوار و ئەو کتێبخانە بچووکەم دەکرد، کە لە سووچێکی هۆڵەکەدا

دانرابوو. لەناکاو ولیەم هاتە بەرانبەرم و بە پێکەنینەوە وتی: هیوادارم شوێنەکەت بە دڵ بێت. منیش هێشتا وەك ئەوەی نەزانم چی لە دەورم ڕوودەدات، بەسەرسامییەوە لە ولیەمم دەڕوانی و وتم: دەکرێ بزانم ئێمە بۆ لێرەین؟ ولیەم بەدەم دانیشتنەوە وتی: ئێرە ئەو شوێنەیە ڕازی کتێبنووسە نادیارەکانی تیا حەشار دراوە.

دوای ئەوە ولیەم باسی ئەوەی بۆ کردم، هەر لە سەردەمانێکی زووەوە و لەگەڵ پەیدابوونی نووسراو و دەستنووس، دەستەیەکی نهێنی هەیە کاریان کۆکردنەوەی هەواڵ و زانیارییە لەسەر دەستنووس، کتێب، نووسەر و خوێنەرە سەیرەکان. تەمەنی ئەم دەستەیەش چەندین سەدەیە و لە زۆربەی شار و پایتەختەکانی دونیادا خەڵکانێکییان هەیە بە نهێنی کاردەکەن. دیارە دوای پەیدابوونی کتێبخانە و کتێبفرۆشییەکانیش، کاری ئەم دەستەیە تەواو ڕێکخراوە و چەند کتێبفرۆشییەك لە گۆشە جیاجیاکانی دنیاوە بەوردی سەرپەرشتیی ئەم دەستەیە دەکەن. دیارە ولیەم خۆی یەکێك بوو لەوان، وەك دواتر زانیم. بەڵام لەبەر پاراستنی نهێنیی کارەکەیان و ئاشکرانەبوونیان، هەوڵیانداوە لە چەند شارێکی گەورەدا بنکەیان هەبێت و هەر یەکێکیان بەشێك لە ئەرشیفی دەستەکەی لا پارێزراو بێت. ئەگەرچی ئەو ناوی بنکە سەرەکییەکانی پێنەوتم، بەڵام باسی یەکێك لەو بنکانەی بۆ کردم، کە لەم ساڵانەی دواییدا وێران کراوە و دەکەوتە شەقامی (المتنبي) لە بەغدا، کە بە شەقامی کتێبفرۆشان ناسراوە و یەکێك لە بنکە سەرەکییەکانی دەستەکەیان لەوێدا بووە و لە پێش نیوەڕۆی ٢٠٠٧/٣/٥ بەهۆی ئۆتۆمبیلێکی بۆمبڕێژ کراوەوە کاول دەکرێت و هەموو ئەرشیفە نهێنییەکەیان لەوێدا دەسوتێت. ئەو ڕۆژە شەقامی موتەنەبی پڕدەبێت لە کتێب و لاشەی سووتاو، بێئەوەی کەس بزانێت لەو تەقینەوەیە بۆ سووتاندنی بەشێك لە ئەرشیفی

کتێبخانەکان بووە، کە لە ژێرزەمینێکی نهێنیی ئەو شەقامەدا بووە و ئەو ڕۆژە دووان لە ئەندامەکانییان لەوێدا و لەناو کاغەز و بەرگی چەرمی کتێبەکاندا دەسوتێن.

ئەو شەوە ولیەم باسی زۆر کتێبخانەی سوتێنراوی لە مێژوودا بۆ کردم، باسی نهێنی کوشتنی زۆر نووسەری بۆ کردم، کە تا ئەوکاتە نەمزانی بوو.

***

# ڕۆژی ١٧ی سێپتەمبەر

مریەم لە زەنگی تەلەفوونەکەی بەئاگا هاتەوە، کە لە هۆڵەکەوە دەنگی دەهات. بەڵام هەرچەندی کرد، نەیتوانی هەستێت و بچێت وەڵام بداتەوە. ماوەیەک لەناو جێگاکەدا مایەوە، بۆ ئەوەی بزانێت سەعات چەندە. کاتێکیش هەستا، لەبەردەم سیسەمەکەدا و لە نزیک قاچییەوە، دەستنووسی ڕۆمانەکەی بینی پەرشوبڵاو لەو ناوەدا کەوتبوو. بۆ ئەوەی کۆی بکاتەوە، بەرەو هۆڵەکە ڕۆیشت. بیری کەوتەوە شەو بەدەم خوێندنەوەوە خەوی لێکەوتووە.

کاتێک دەنگی شێرزاد لەوسەری هێڵەکەوە نیوەڕۆ باشی لێکرد، مریەم زانی زۆر درەنگ بەئاگا هاتۆتەوە. پاشان شێرزاد داوای لێبووردنی لێکرد، بەوەی خەبەری کردۆتەوە. بەڵام مریەم دڵنیای کردەوە باشتر ئەو کارەی کرد، چونکە خۆشی نازانێت بۆ ئەوەندە لە جێگادا ماوەتەوە. شێرزاد پێیوت پێدەچێت بەیانی سەفەر بکات و بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی خۆی، هەربۆیە بیری لەوە کردۆتەوە ئەگەر بتوانێت، ئەوا حەزدەکات ئەمڕۆ ببینێت. مریەم هەرزوو بڕیاریدا و وا ڕێکەوتن دوای دوو سەعات لە شوێنەکەی دوێنێ یەکتر ببیننەوە.

مریەم بیری کردەوە دووشێکی خێرا بکات و شتێکی سادەش بخوات، بەڵام دوای ئەوەی لە حەمام هاتە دەرەوە، ئارەزووی لەوە نەبوو بەتەنیا شتێک ئامادە بکات بۆ خواردن، وەک ئەوەی بیەوێت زوو لەم تەنیاییە

بچێتە دەرەوە، کە بۆنەکەی هەراسانی دەکرد. هەربۆیە ماوەیەک خەریکی قژ وشک کردنەوە و خۆ ڕازاندنەوە بوو، بۆ جلەکانیشی زۆر بیری لێنەکردەوە و پانتۆڵێکی سێ چارەک و تیشێرتێکی سپی لەبەرکرد. بەڵام بەلایەوە گرنگ بوو چ بۆنێک لە خۆی دەدات، تا دواجار دوو بۆنی بەکارهێنا، کە یەکێکیانی لە سەفەرێکی پاریسدا کڕی بوو. لەناو دەرگاکە بیری کەوتەوە ددانی نەشۆردووە، گەڕایەوە و بەپەلە خۆی کرد بە تەوالێتەکەدا، کە لەگەڵ دەستبردن بۆ فڵچەی ددان شۆردنەکە، دەستی بەر شووشەیەک قۆڵۆنیا کەوت، کە خۆی بە دیاری بۆ شێرکۆی کڕی بوو. لەبەر خۆیەوە جنێوێکیدا و تاقەتی نەبوو پارچە شکاوەکانی شووشەکەی کۆبکاتەوە.

لە وێستگەی شەمەندەفەرەکە حەوت خولەک کاتی هەبوو تا هاتنی شەمەندەفەرەکە، هەربۆیە گەڕایەوە و چوو لە دووکانێک قاوەیەک و چۆرەکێکی کڕی و گەڕایەوە بۆ شۆستەی چاوەڕوانییەکە.

بەشێکی زۆری ڕێگاکەی، بە پاڵدانەوە و چاونووقاوییەوە بردەسەر، تا گەیشتە ئەو ویستگەیەی لە نزیکییەوە شێرزاد چاوەڕوانی دەکرد، کە هەروەک دوێنێ و لەسەر هەمان کورسی، چاوەڕوان بوو.

شێرزاد بە پێکەنینەوە وتی: وابزانم ئەمڕۆ لە خەوم کردیت، نەمزانی وا درەنگ لە خەو هەڵدەستیت. بەڵام مریەم ڕاستەوخۆ وەڵامی نەدایەوە و وتی: خۆشم نازانم دوێنێ شەو، کەی و چۆن خەوتووم، لەوانەیە ماندوو بووبێتم. شێرزادیش وتی: دەی ئەمڕۆ دەتوانین لە جێگایەک دابنیشین تا ماندوو نەبیت. مریەم سەیرێکی کرد و وتی: گرنگ نییە، چونکە هەستدەکەم ئەمڕۆ شت زۆر هەبێت تا لەبارەیەوە قسە بکەین. دوای ئەوەی قژی لەسەر دەموچاوی لادا، درێژەی پێدا و وتی: دەمەوێت بە ڕاستی پێم بڵێیت تۆ کێیت، پێشتر منت ناسیوە یاخود لە هیچ کوردێکیترەوە زانیاریت لەسەر من هەیە؟

شێرزاد دڵنیای کردەوە کە هیچ شتێکی وا لە ئارادا نییە و هەر ئەو کەسەشە، کە دوێنێ کەمێک لەبارەی خۆیەوە بۆی دواوە. پاشان بەسەرسامییەوە پرسی هیچ بووە؟ مریەمیش بە کەمێک تووڕەیی تێکەڵ بە نازەوە وتی: نا، کەواتە ئەمڕۆ باسی ڕۆمانەکەتم بۆ بکە، بیریشت نەچێت باسی کتێبفرۆشییەکەی ولیەمم بۆ بکەیت.

شێرزاد پێکەنی و وتی: بە دڵنیاییەوە، چونکە ڕووداوە گرنگەکان لەو کتێبفرۆشییەدا ڕوودەدەن.

ئەوکاتە گەیشتبوونە نزیک دوو ماسیگر، کە بەبێ دەنگی بەدیار قولاپەکانیانەوە وەستابوون. شێرزاد وتی: سەرەتای نووسینی ڕۆمانەکە دەگەڕێتەوە بۆ پێش ئەوکاتەی تووشی کێشەببم لەگەڵ کونسوڵخانەی عێراق بەماوەیەک، مەبەستم کێشەی ناوەکەمە. ئەوکاتە لە هەوڵی نووسینی ڕۆمانێکدا بووم، دەمویست لە ڕێگایەوە باسی ژیانی چوار ئافرەتی کورد بکەم، کە لە خۆرئاوا دەژین. هەر یەکێک لەوانە چارەنووسێکی جیاواز دەژی و بەرێگایەک گەیشتۆتە خۆرئاوا. بەڵام هەموشیان خاڵی هاوبەش لەنێوانیاندا هەیە. واشم دانابوو ڕووداوەکانی ڕۆمانەکە لەم شارەدا بن.

مریەم هەوڵیدا سەرسامی خۆی بشارێتەوە، هەربۆیە بە پێکەنینەوە وتی: ناوت بۆ ئەو چوار ژنە دانابوو؟

شێرزادیش وتی: بەڵێ، ئەگەرچی هێشتا لەسەرەتای نووسینی ڕۆمانەکەدا بووم، بەڵام وام دامنابوو چوار ژن بەناوی ڕووناک، مەلاڵە، شەوبۆ و مریەمەوە لەم شارەدا بژین و لە ڕێگای ژیان و پەیوەندیی هەر چواریانەوە، باس لەو ڕووە شاردراوەیەی ژیان بکەم، کە ئێمەی ڕۆژهەلاتی لە خۆرئاوا هەمانە. مەبەستمە بڵێم دەمویست لە ڕێگای پەیوەندی و تێڕوانینی ئەو چوار ئافرەتەوە بۆ سێکس و پەیوەندی نێوان نێر و مێ، باس لە ژیان بکەم لەنێوان کولتووره جیاوازەکاندا.

هەریەکێکیش لەو چوار ژنە، بە ڕێگایەکی جیاواز گەیشتۆتە ئەم شارە و تووشی جیابوونەوە بووە. بۆ نموونە شەوبۆ لەڕێگای هاوسەرگیرییەوە سەفەردەکات و بەماوەیەکی کەم، بێئەوەی هۆکەی دیار بێت، میردەکەی لێی جیادەبێتەوە و دوای ئەوە بۆ ماوەیەک لەگەڵ پیاوێکی سویدیدا دەژی و لە کاتی گێڕانەوەی ڕووداوەکانیشدا، بە تەنیا لەگەڵ سەگێکدا دەژی. شەوبۆ لەو کەسانەیە کە هەر زوو بە هەڵسوکەوت و قسەکردنیش، بووە بە کەسێکی ڕۆژئاوایی و هەمیشە لە قسەکانیدا بەراوردی نێوان کولتووری کوردی و سویدی دەکات. دیارە لەو کەسانەیە کە بە نزم دەڕوانێتە کلتورێک لەبەرانبەر کلتورێکیتردا، کولتوورێکی پیس یاخود گرنگی بە پیسی دەدات لە بەرانبەر کولتوورێکی پاک یاخود گرنگی بە پاک و خاوێنی دەدا. کولتوورێکی ژن کوژ لەبەرانبەر کولتوورێکی ئازادی بەخشدا. بیریشم نەچێت، شەوبۆ چەند تاتۆیەکی لەسەر لەشی نەخشاندووە. دیارە لە شوێنی هەستیاریشدا. شێرزاد وای وت و بزەیەکی شەرمنانەی بۆ کرد. پاشان درێژەی پێدا: شتێکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە، لە ڕۆمانەکەدا وام دانابوو کاتێک شەوبۆ مامەڵەی سەفەرەکەی تەواو دەبێت و یەکەمجار کە لە تورکیاوە لەگەڵ مێردەکەیدا سەفەر دەکات، ئەوکاتەی فڕۆکەکە دەگاتە ناوچەرگەی ئەوروپا و مێردەکەی لە پەنجەرەکەوە دەریاچە و سەرزەمینە سەوزەکەی خوارەوەی نیشان دەدات، شەوبۆ هەڵدەستێت و دەچێت بۆ تەوالێت. کە لەوسەر دەگەڕێتەوە، تەنوورەکەی کورت کردۆتەوە و کراسێکی بێ قۆڵی لەبەرکردووە. بەڵام ڕووناک لە هەموویان کۆنترە لە خۆرئاوا و مێردێکی قاچاخچی و مێبازی دەبێت، کە لە ڕووداوێکی تەمومژاویدا لە ڕووسیا کوژراوە. ڕووناک کەسێکی قۆشمەچییە و تۆڕێکی بەربڵاو پەیوەندی لەناو کورد و عەرەبەکاندا هەیە و دووجاریش بەپارە مامەڵەی هاوسەرگیری بۆ کەسانیتر کردووە و لە کوردستانەوە هێناونی. ڕووناک لەو ژنانەیە، نایەوێت بڕوا بە تەمەنی خۆی بکات و هەموو

سەرنجی لەسەر پیاوانە و بە قسە و نوکتەی سێکسی ناسراوە.

مریەم بێ دەنگ ڕێی دەکرد و هیچی نەدەوت، شێرزادیش درێژەی بە قسەکانیدا: بەڵام هەڵاڵە خاوەن لەش و لارێکی سەرنجڕاکێش و سێکسییە و جیاواز لەوانیتر، حەزی بە کارکردنە لەناو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا و وەک شەوبۆ پەرگیرە لە بیروڕادا، بەوەی باوەڕی بە هاوسەرگیری نییە، دوای ئەوەی دوو ئەزموونی سەرنەکەوتووی شووکردنی دەبێت و هەست دەکات هەڵخەڵەتێنراوە. ئیتر ئاوا ڕۆمانەکە باسی ژیانی نهێنی ئەو چوار ژنە دەکات.

مریەم سەری هەڵبڕی و وتی: ئەی باسی چوارەمیانت نەکرد؟

شێرزاد پێکەنی و وتی: بەڕاست سەیرە، خەریک بوو مریەمیانم بیربچێت، کە کەسایەتی سەرەکی ڕۆمانەکەیە. مریەم جیاواز لەوان، ئەگەرچی ئەویش لە ژیاندا گرفتی خۆی هەبووە و تووشی جیابوونەوە بووە، بەڵام لەکاتی ڕووداوەکاندا، لەگەڵ کەسێکدا دەژی و تەنیا نییە، هەرچەند ماوەیەک لە ژیانیدا بە ئازادی ژیاوە و کۆمەڵێک پەیوەندی لەگەڵ پیاواندا هەبووە. بەڵام لەو ژیانە ماندوو دەبێت و بڕیاردەدات لەگەڵ کەسێکدا بژی.

شێرزاد وەستا و بەدەنگێکی جدییەوە وتی: دەزانی کاتێک تووشی کێشەی ناوەکەم بووم لەگەڵ کونسوڵخانەی عێراقدا، ئیدی ڕێڕەوی نووسینی ڕۆمانەکە گۆڕا، بەوەی لە خۆم دەپرسی: ئەوەی دەژی، ناوەکانمانە یاخود خۆمانین. چونکە من بۆ خۆم چوومە کونسوڵخانە، بەڵام ئەوان دەیانووت ئێمە بەو ناوەوە تۆ ناناسین و کەسێک نییە بەو ناوەوە. هەربۆیە بیرم لەوە کردەوە، ئەو کەسەی لەگەڵ مریەمدا دەژی، کەسێکی وا بێت خەریکی نووسینی ڕۆمانێک بێت لەبارەی (ناو)ەوە. ئەمەش مریەم کاتێک ئاشکرای دەکات، دوای ئەوەی بەیانییەک بڕیار دەدات لێیجیابێتەوە و دەستنووسی ڕۆمانەکەی دەخوێنێتەوە. هەربۆیە

دوێنێ چووم بۆ ئەو کتێبفرۆشییە، تا سەیری شوێنەکە بکەمم و بزانم هەروەک ئەوە وایە کە پێش چەند ساڵێک بینیومە و لە ڕۆمانەکەدا باسم کردووە. چونکە ئەو شوینە قورساییەکی زۆری هەیە لە ڕۆمانەکەدا، کە هەوڵمداوە بەشێوەیەک بیگێڕمەوە، کە لە ڕێگای خوێندنەوەی مریەم بۆ دەستنووسەکە، ناوەڕۆکی ڕۆمانەکە بەدەربکەوێت، بەوەی...

مریەم قسەکەی پێ بڕی و وتی: بەڕاست تۆ پێشتر منت نەناسیوە؟

شێرزاد بەسەرسامییەوە وتی: سەیرە، تۆ پێشتر هەمان پرسیارت لێکردم و من دڵنیام کردیت، کە بە ڕێکەوت تۆم بینیوە. مریەمیش وتی: زۆرجار ڕێدەکەویت لەناو پیاوانی ئێمەدا باسی ئافرەت بۆ یەکتر بکەن، یاخود ژمارە تەلەفوونەکەی دەدەن بەیەکتر، ئیدی پیاوانیش ڕێگایەک دەدۆزنەوە بۆ نزیک بوونەوە لێی.

شێرزاد بە سەرسامییەوە وتی: لێت ناشارمەوە ئەو ڕۆژەی تۆم بینی، هەستم دەکرد غەریب نیت لە بەرچاوم، وەک ئەوەی پێشتر بتناسم. ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ پرسیارکردنم لێت.

مریەم ماوەیەک بێدەنگ بوو، وەک ئەوەی خۆی کۆبکاتەوە تا وتی: دەزانیت من ئەو مریەمەم تۆ باسی دەکەیت و ناوم بەهار نییە.

شێرزاد وەک ئەوەی تێنەگەیشتبێت پرسی مەبەستت چییە؟

مریەم لەسەرخۆ درێژەی پێدا مەبەستم ئەوەیە، ئەوەی تۆ باست کرد، ژیانی من بوو. تەنانەت سێ ئافرەتەکەیتریش کە باستکردن، هاوڕێی منن و هەروان وەک تۆ وتت. منیش ئەو ڕۆژە ڕاستم نەکرد، کە وتم ناوم بەهارە.

شێرزاد لەبەرخۆیەوە وتی: دیسان یاریی ناوەکانە. دوای ئەوە ماوەیەک بێدەنگ بوو.

***

ئەو ڕۆژە مریەم و شێرزاد بێ هیلاک بوون، بە کەناری دەریا، تووڵەڕێی ئەو مارستانەکان شەقامە قەرەبالغەکاندا پیاسەیان کرد و لەبارەی ڕۆمانە تەواونەکراوەکەی شێرکۆ، چارەنووسی ڕووناک و هەڵاڵە و هەموبۆوە دوان. مریەم دەیویست بزانێت لە ڕۆمانەکەدا شێرکۆ بۆ ون دەبێت و چی بەسەر دێت. شێرزادیش، کە نەیدەتوانی وەڵامی بداتەوە، بەوپێیەی هێشتا ڕۆمانەکەی تەواونەکردووە و نازانێت چی ڕوودەدات، دەیویست دڵنیابێت ئەوەی لە تەنیشتییەوە ڕێ دەکات، کەسێکی ڕاستەقینەیە و تەنها ناوێک نییە و بژی. هەربۆیە چەند جارێک بە هێمنی دەستی مریەمی گرت و لەناو دەستیدا یاری بە پەنجەکانی کرد و دواجار داوای لە مریەم کرد دەستنووسەکەی شێرکۆی نیشان بدات. مریەمیش بە دوو چاوی تەڕ و فورسەوە چاوی بڕیبووە چاوی شێرزاد.

***

کاتێک مریەم دەرگای کردەوە، پێش شێرزاد چووە ژوورەوە و گڵۆپی سەرەکەی داگیرساند. شێرزادیش بەدەم داکەندی پێڵاوەکانییەوە، چاوێکی بە ماڵەکەدا گێڕا و هەستی بە شەپۆلێکی خاو کرد لە بۆنی قوڵوپیا. مریەم بەدەم فەرموو لیکردنییەوە، درزێکی کردە پەنجەرەی مەتبەخ و ئامێری قاوە گەرم کردنەکەشی داگیرساند. پاشان هەردووکیان لە هۆڵەکە دانیشتن و دوای ئەوەی شێرزاد سەرسامی خۆی بۆ جوانی و ڕێکوپێکی ماڵەکە دەربڕی، کە نیگارانە و پارچە مۆبیلەکان و ڕەنگی پەردە و تابلۆ و بەڕە و... جوان گونجاو بوون لەگەڵ یەکتردا. بەتایبەت سەیری بەڕەکەی ژێر قاچی کرد و لە ڕەنگەکانی ڕاما. بیری کەوتەوە، کە ئەمیش هەمیشە حەزی لەو جۆرە نەخشانە بووە، کە لە بەڕە کوردییەکاندا هەن. مریەم بەدەم پێکەنین و سوپاس کردنەوە هەستا و چوو دەستنووسی ڕۆمانەکەی بۆ هێنا.

شێرزاد بەوردی سەیری نووسراوەکەی دەکرد و پەڕە دوای پەڕەی هەڵدەدایەوە و تا دەهات سەرسامی زیاتر بە سیمایەوە دەردەکەوت. جارجار لەبەرخۆیەوە ورتە ورتێکی دەکرد، بێئەوەی گوێ بە مریەم بدات، کە بەسەرییەوە وەستابوو. لەناکاو سەری هەڵبڕی و وتی: سەیرە، ئەمە هەر ئەو دەستنووسەیە، کە من نووسیومە.

مریەم بەجۆرێک لایەوە دانیشت، کە ڕانی بەر ڕانی شێرزاد کەوتبوو، بەڵام لەوکاتەدا هیچ ئاگای لەوە نەبوو، وتی: بڵێی بە ڕێگایەک دەستنووسەکەی تۆ نەدزرابێت و نەگەیشتبێتە لای شێرکۆ؟ شێرزاد دڵنیای کردەوە شتی وا مەحاڵە، چونکە دڵنیایە دەستنووسەکە لە جانتای سەفەرەکەیدایە و شەو لە ماڵی هاوڕێکەی، چەند دێڕێکی لێنووسیوە.

مریەم بە جۆرێک لە شپرزەییەوە پرسی: ئەی ئەم هەموو لێکچوونە لەنێوان نووسینەکەی تۆ و ئەم ژیانەی منی تیادا دەژیم، مانای چییە؟

شێرزاد دوای ئەوەی کەمێک لە مریەم وردبووەوە، وتی: تەنها شتێک بتوانێت ڕاڤەی ئەمە بکات، ئەوەیە کە تەنها ناوەکان دەژین، نەوەک مرۆڤەکان. درێژەی پێدا و باسی ئەوەی بۆ مریەم کرد، کە مەبەستی لەوەیە ناوەکانیش دەتوانن وەک مرۆڤە ڕاستەقینەکان بژین. بگرە زیاتریش. لەوێدا نموونەی کەسایەتی هاملێتی بۆ هێنایەوە، کە نەوەک تەنها وەک مرۆڤێک ژیاوە، بەڵکوو زیاتر لە مرۆڤێک ژیان دەکات. وتی: لەم ساڵانەی دواییدا، ڕۆمانێکم خوێندەوە بەناوی (جیهانی سەددام حسەین)ەوە، کە ٢٠٠٣ بڵاوکراوەتەوە. باسی ئەوەت بۆ ناکەم، ڕۆمانەکە لەچی دەدوێت، چونکە لە ناونیشانەکەیەوە زۆر شت تێدەگەیت. بەڵکوو دەمەوێت باسی نووسەرەکەیت بۆ بکەم، کە کەسێکە بوونی نییە. تەنها ناوێکە. ڕۆمانەکە ناوی (مەهدی حەیدەر)ی بە سەرەوەیە و بۆ خۆ ون کردنیش، چەند ڕێگایەکی گرتۆتە بەر. تۆ دەزانیت کاتماندۆ چییە؟ شێرزاد لە مریەمی پرس، کاتێکیش مریەم بەسەر ڕاوەشاندن، بە

نەخێر وەڵامی دایەوە، شێرزاد درێژەی پێدا: ئەو مەهدی حەیدەرە، کە بوونی نییە بەوپێیەی نووسەرێکی عەرەب نییە بەو ناوەوە، لە کۆتایی ڕۆمانەکەیدا وای نووسیوە، کە ١٩٩٢ لە کاتمانـدۆی پایتەختـی نیپـاڵ دەستی بە نووسینی ئەم ڕۆمانە کردووە و لە لیمای پایتەختی پێرۆ، ٢٠٠٢ لە نووسینی ڕۆمانەکە بۆتەوە. دوو شاری سەیر، کە نووسەرێکی عەرەب تیایاندا بژی و خەریکی نووسینی ڕۆمانێکیش بێت. دەزانیت لەم چەند ساڵەی ڕابردوودا، ڕۆمانێکی ئاواش لەبارەی تۆباماوە نووسرا، بێ ئەوەی نووسەری هەبێت، یاخود ڕاستر نووسەرەکەی دیارنییە و کەسێکی واقیعی بێت. لەوانەیە کەسێک بڵێت، بەهۆی ترسەوە، کەسێک لە پشت ئەو کتێبەوە وەستاوە و نایەوێت خۆی ئاشکرا بکات. بەڵام ئەی چۆنە ئەگەر وا بیرمان لێکردەوە، کە ئەوە ناوەکانن دەتوانن بژین و تەنانەت کتێبیش بنووسن.

مریەم بەدەم پێکەنینەوە هەستا و وتی: هەروەک من؟ بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێت، بەرەو مەتبەخەکە ڕۆیشت و لەوسەرەوە بە دوو کوپ قاوەوە گەڕایەوە. کاتێک لەسەر مێزەکەی بەردەمی شێرزاد دایینا، چوو لەبەرانبەری شێرزاددا دانیشت و قاچی خستە سەر قاچ. شێرزاد وتی: ئەو ماوەیە زۆر بیرم لەم جۆرە کتێبانە دەکردەوە، کە ناوی وەهمی نووسیوونی، یاخود ڕاستتر بڵێم، کەسانی وەهمی و نەبوو نووسیونی. لەگەڕانم بەدوای ئەو جۆرە کەسانەدا، کەوتم بەسەر ژمارەیەکی زۆر لەو کتێبانەی هەر نووسەریان نییە، یاخود وەک دەڵێن نووسەرەکانیان دیار نین. من ئەوکاتە لەخۆم پرسی: ئایا نووسەری هەزار و یەک شەوە، نەیدەتوانی لەو کتێبە گەورەیەدا و بەشێوەی مەتەڵ یاخود ڕازێک ناوی خۆی بشارێتەوە؟ بەڵام ئەمەی بۆ نەکرد؟ ئایا لەبەر ترس بووە؟ باوەڕ ناکەم تەنها ترس ڕافەی ئەم دۆخە سەیرەی ئەو نووسەرانە بکات، کە ناوی خۆیان نەخستۆتە سەر دەستنووس و کتێبەکان. ئەگەر نامەکانی

ئێخوان سەفا ئاوا بە نادیار و پەنهانی نووسراون، ئەی سەدام حسەین بۆ ناوی خۆی ناخاتە سەر ڕۆمانەکانی؟ خۆ ناتوانین بڵێین ئەویش ترساوە. ئەوکاتە من وای بۆ چووم، کە سیحرێکی سەیر لە پشت نەنووسینی ناو لەسەر کتێبەکانەوە هەیە، وەک ئەوەی کتێبە مەزنەکان، بێنووسەر بن. کتێبە بێنووسەرەکانیش، مێژوویەکی دوور و درێژیان هەیە. وەک ڕۆمانی ژیانی لاساریۆ دی تورمیس، کە لە دەوروبەری ١٥٥٤دا نووسراوە. یاخود قورئان کە دانەر و پاشان نووسەرەوەی هەیە، نەوەک نووسەر. سەدام حسەینیش لە ڕۆمانەکانی هەروا دەنووسێت: (روایة لمؤلفها)، وەک ئەوەی سەدام حسەین نووسەرەوەی ڕۆمانەکە بێت و دانەرەکەی شتێکی باڵاتر بێت. پاشان کتێبە بێنووسەرەکان لە مێژوودا دەمێننەوە. ئیتر بیرم لەوە کردەوە، ڕۆمانێک لەبارەی کتێبە بێنووسەرەکانەوە بنووسم و هەستم بە دۆزینەوە و باس کردنی ئەو کتێبانە. بەڵام لەمیانەی گەڕانمدا، زۆرێک لەو کتێبانەم بینی کە بەناوی وەهمییەوە نووسراون، ناوێک بوونی نییە، وەک ئەوەی ناوەکان توانای ژیان و نووسینییان هەبێت.

مریەم بەوردی گوێی گرتبوو، ئەگەرچی ئەو دنیایەی شێرزاد لێی دەدوا، زۆر نامۆ بوو بەلایەوە. بەڵام چاوەڕێ بوو. شێرزاد وتی: دەزانی پیاوێکی ڕۆماننووسی جەزائیری هەیە بەناوی (یاسەمینە ئەلخەضرا)وە، ساڵی ١٩٥٥ لە جەزائیر لەدایکبووە و ئێستا لە فەرەنسا دەژی، وەختی خۆی ئەفسەر دەبێت لە سوپادا و لەبەر کارەکەی، ڕۆمان دەنووسێت و بەناوی ژنەکەیەوە، کە ناوی (یاسەمینە)یە، بڵاویان دەکاتەوە، چونکە دەزانێت سوپا ئەو کارە لە ئەفسەرێک قبوڵ ناکات و تووشی لێپێچینەوەی دەکات. بەڵام دوای کۆتایی هاتنی خزمەتی لە سوپادا و ڕۆیشتنی بۆ فەرەنسا، دوای ئەوەش کە خۆی ئاشکرا دەکات، کەچی هەر بەو ناوە ئافرەتانەییەوە دەنووسێت و نایەوێت بەناوی (محمد مولسهول)ەوە بنووسێت، کە ناوی خۆیەتی. ئەم ئارەزووە منی بەرەو دونیایەکی سەیر و نامۆ پەلکێش کرد، کە دونیای

نووسەرە وەهمییەکانە. ئەو نووسەرانەی لە پێناو نووسیندا، نێرگسییەت لە خەیاڵیاندا دەکوژن. وەک ئەو نووسەرە پورتوگالییە کردی، کە ناوی فێرناندۆ پێسەوایە و بەناوی چەندین کەسایەتی وەهمییەوە دەینووسی.

مریەم بەدەم دەست بردن بۆ قاوەکەیەوە، پرسی: ئیتر ویستت رۆمانێک لەو بارەیەوە بنووسیت؟

شێرزادیش وەک ئەوەی بیەوێت پشوویەک بدات، وتی: بەڵێ، وەک خوێندووتەتەوە. پاشان شتێکی دەگمەنیشم بۆ ئاشکرابوو. وەک ئەو نوخەی (رۆبێرت فیسک) تێیدەکەوێت، ئەگەرچی پێچەوانەیە. بەوەی رۆژێکی سەرەتای ٢٠٠٨ رۆبێرت، کە پەیامنێری رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە لە رۆژنامەی (ئیندیپێندێنت)ی بەریتانی، لە لوبنان دەبێت، نووسخەیەکی وەرگێڕدراوی کتێبەکەی خۆی بۆ دەبەن بە عەرەبی، کە ناوی (سەدام حسێن لە لەدایکبوونەوە تا شەهیدبوون)ە. ئەوەی بەلای رۆبێرتەوە سەیرە و پێیاندەڵێت، ئەوەیە کە ئەو هەرگیز کتێبێکی وای نەنووسیوە تا وەربگێڕدرێت بۆ سەر زمانی عەرەبی. ناچار دەچێت بۆ قاهیرە و سۆراخی خانەی بڵاوکردنەوەکە دەکات، بۆی دەردەکەوێت ئەو خانەیەی کتێبەکەی بڵاوکردۆتەوە، بوونی نییە و ژمارە تەلەفوونەکەشی هەمیشە داخراوە. ئەگەرچی کتێبەکە لە ٢٠٠٧دا، بە فەرمی ژمارەی سپاردنی بۆ وەرگیراوە. پاش هەوڵێکی زۆر، رۆبێرت سەرکەوتوو نابێت لە دۆزینەوەی ئەو کەسە/کەسانەی (ئەگەر هەبن) لە پشت ئەو کتێبەوەن و داوایانەتە باڵ ئەم ناچار لەو بارەیەوە وتارێک هەر لەو رۆژنامەیەدا بڵاودەکاتەوە، کە کاری تێدا دەکات.

مریەم وەک ئەوەی پەلەی بێت، پرسی: ئەوکاتەی ولیەم، شێرکۆ لە ماڵە نهێنییەکەدا دەبینێت، باسی چی بۆ دەکات؟

زۆر نهێنی پەیوەندی بەو یەکتربینینەوە هەیە، شێرزاد وای وت و کەمێک باری دانیشتنەکەی چاککرد، چونکە ئەو ئێوارەیە ولیەم شێرکۆ

دەباتـە نـاو دونیـای پـڕ ڕاز و نهێنیـی کتێبسـازەکانەوە و بەشـێک لـەو ئەرشـیفەی نیشـان دەدات، کـە لای ئـەو بـە نهێنـی پارێـزراوە و پەیوەنـدی بەهەندێـک کووشـتنەوە هەیـە.

مریـەم بـە سەرسـامییەوە پرسـی ئـەو کووشـتنانە، چ پەیوەندییەکییـان بـە شێرکۆوە هەیـە؟

دەبێت تـۆ هـەوڵ بدەیـت لـە ولییەم تێبگەیـت، شێرزاد وای وت و درێژەی پێدا، ولییـەم یەکێکـە لـەو کەسـە کـەم و نهێنییانـەی لـە ئێسـتا سـەرۆکایەتی ئـەو دەسـتە نهێنییـە دەکـەن، کـە کاریـان کۆکردنـەوە و پاراسـتنی هـەواڵ و دەستنووسـی کتێبنووسـە پەنهانەکانـە و بەشـێکی زۆری ئەرشـیفی ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت دێتـەوە لای ولییـەم. ئەمـەش پەیوەنـدی بە چارەنووسـی شێرکۆوە هەیـە. بزانـە، لـە مێژوویەکـی زۆر کۆنـەوە، جۆرێـک لـە نووسـەر هەیـە، کـە خولیایەکـی سـەیریان هەیـە، بـەوەی جگـە لـەوەی بەنـاوی خـوازرا، یاخـود وەهمییـەوە دەنووسـن، زۆرجـار کتێبێـک دەنووسـن و بـە دزییـەوە لـە کتێبخانەیەکدا بەجێی دەهێڵـن تـا بـەو ڕێگایـە بگاتـە دەسـت خوێنـەر. دیـارە لـەو سـەردەمانەی تـرس لـە دەسـەڵات زیـاد دەکات، ژمـارەی ئـەم جۆرە کتێبانـە و کوشـتنی نووسـەرانیش لـە ڕووداوی تەمومـژاوی و نادیـاردا زیاتـر دەبێـت. ولییـەم یەکێکـە لـە ئەندامانـی ئـەو دەسـتە نهێنییـەی لـە پشـت کتێبخانەکانـەوەن و لـە هەمـوو گۆشـەیەکی ئـەم دونیایـەوە ڕاپۆرتـی ورد لەسـەر ئـەو نووسـەرانە کۆدەکەنـەوە و دەستنووسـە دەگمەنەکانیـان دەپارێـزن. بـەڵام تەقینەوەکـەی شـەقامی موتەنەبی لـە بەغـدا، ئاماژەیەکە بـۆ ئاشکرابوونی یەکێـک لـە بنکـە گرنگەکانـی ئـەو دەسـتەیە. چونکە لەناو ئاگـر و وێرانـەی دوای تەقینەوەکـەدا، کۆمەڵێک لـە ئەرشـیفی ئـەم دەستەیە دیارنامێنێـت و دەکەوێتـە دەسـت دەزگا نهێنییـەکان. ئەمـەش ئاماژەیەکـی ترسـناکە، بەتایبـەت دوای ئـەوەی خـاوەن کتێبخانەیـەک لـە سـلێمانییەوە دێـت بـۆ سـوید، تـا جانتایەکـی پـڕ لـە دەسـتنووس و ڕاپۆرتـی گرنگـی

دەربازکراو لە تەقینەوەکەی شەقامی موتەنەبی، بگەیەنێتە دەستەی کتێبخانە نهێنییەکان لە سوید، ئەویش دیار نامێنێت و دوای چەند مانگێک لاشەکەی لەلایەن ڕاوچییەکەوە لە قولایی دارستانێکدا دەدۆزرێتەوە و جانتاکەشی دیارنامێنێت. لەم ڕووداوەوە چارەنووسی شێرکۆش دەگۆڕدرێت، بەوەی ولیەم داوای لێدەکات ئەو جانتایەی بۆ بدۆزێتەوە، دوای ئەوەی ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ)ی لە ڕەفەی کتێبخانەکەیدا بۆ دادەنێت و وردە وردە پەلکێشی دەکاتە ناو نهێنی دەستەکەیانەوە. بەڵام تا بتوانێت شێرکۆ ڕازیبکات، هەندێک بەڵگەنامەی کۆنی نیشان دەدات، کە شێرکۆ تووشی سەرسوڕمان دەکەن. بەوەی دەرگای نهێنی کوژرانی چەند نووسەرێکی بە ڕوودا دەکاتەوە. بۆ نموونە، ولیەم لەناو ئەرشیفی نهێنیی دەستەکەیاندا، ڕاپۆرتێکی زۆر کۆنی شاردراوە لەژێر تەختەی بنی سندوقێکدا دەردەهێنێت، کە پەیوەندی بە کوژرانی جەمال عیرفانەوە هەیە. بە ڕاست تۆ جەمال عیرفان دەناسیت؟

مریەم تەنها بەسەر ڕاوەشاندن وەڵامی بە نەخێر دایەوە.

بزانە بەپێی ڕاپۆرتەکەی لای ولیەم، جەمال عیرفان ساڵی..... لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموددا و لە سلێمانی دەکوژرێت. ئەو پیاوە وەک منەوەرێکی سەردەمی خۆی سەیردەکرێت و باوەڕی بە پێشکەوتن هەبووە. کوشتنەکەشی وەک لە بەڵگەنامەکەدا هەیە، دوای ئەوە دەبێت، کە جەمال عیرفان کتێبێک بەنهێنی دەنووسێت و بە دزییەوە لەناو کتێب و دەستنووسەکانی مزگەوتی (حاجی حان) دایدەنێت. بەڵام هەر زوو کارەکەی لەلایەن ئەو دەستەیەوە ئاشکرا دەکرێت، کە وەک لە ڕۆمانی (چەتەکانی خەیاڵ)دا باسکراوە، کاریان گەڕانە بەدوای ئەو جۆرە کتێبانەی بە دزییەوە بڵاودەکرێنەوە، ئیدی هەر چەند ڕۆژێک دوای ئەوە دەکوژرێت. ولیەم دوای ئەوە هەوڵدەدات زیاتر سەرنجی شێرکۆ ڕابکێشێت، ڕاپۆرت و کتێبێکی دەستنووس پیشانی شێرکۆ دەدات، کە

سەبارەت بە کوشتنی عەبدولخالق مەعروفە لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا.

شێرزاد ئەمجارە هیچ پرسیاری لە مریەم نەکرد و درێژەی پێدا: شێرکۆش وەک زۆر خەڵکیتر، تا ئەوکاتە وای زانیبوو، کە عەبدولخالق مەعروف دوای بڵاوکردنەوەی کتێبێک لەسەر ئافرەت لە ئیسلامدا کوژراوە، بەڵام ولیەم نامەیەکی نهێنی دەستەکەیان لەو بارەیەوە نیشانی شێرکۆ دەدات، کە هەفتەیەک دوای کوژرانەکەی، لە هەولێرەوە بۆیان نووسراوە و باسی ئەوەی تێداکراوە، کە عەبدولخالق لەسەر کتێبێکی ترسناک لەبارەی ئیسلامەوە کوژراوە، کە دوای ئەوەی دەینووسێت، ڕۆژێک بەدزییەوە نووسخەیەکی لەناو ڕەفەی کتێبفرۆشییەکدا بەجێ دەهێڵێت. بەڵام کەسێک چاوی لێی دەبێت و هەرئەوەش دەبێتە هۆی ئاشکرابوونی لەلایەن ئەوانەوە، کە بەدوای کتێبە نهێنییەکاندا دەگەڕێن. بەڵام نووسخەکەیتری ئەو کتێبە، لەناو ئەرشیفەکەی ولیەمدا هەڵگیرابوو، بێ ئەوەی شێرکۆ هیچ پرسیارێک لەبارەیەوە بکات، یاخود داوای بینینی بکات.

مریەم بە سەرسوڕماوییەوە پرسی: بەڵام ئەمانە چ پەیوەندییەکیان بە دیارنەمانی شێرکۆوە هەیە؟

شێرزاد کەمێک دەنگی نزم کردەوە و وتی: سەرئەنجام ولیەم داوا لە شێرکۆ دەکات، تا هەوڵبدات ئەو جانتایەیان بۆ بدۆزێتەوە، کە کتێبفرۆشەکە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی بۆ سوید و لە مردنەکەیەوە دیارنەماوە. ئەو بەیانییەش تۆ داوای جیابوونەوەی لێدەکەیت، ئەو بڕیاری دابوو بڕوات بەدوای جانتاکەدا بگەڕێت.

مریەم بە شپرزەییەوە پرسی: ئێستا شێرکۆ لە کوێیە؟ شێرزاد بە ساردییەکەوە وتی: ڕۆمانەکە تا ئێرەی نووسراوە.

مریەم بەخۆشییەکەوە وتی: بەڵام دەتوانم بەیانی بچم بۆ لای ولیەم د

لەو بپرسم. شێرزاد بە دڵنیاییەکەوە وتی: باوەڕناکەم بتوانیت، چونکە لە نەسڵی دوای ئەوەدا، ولیەم دەکوژرێت و ماریاش بە شێوەیەکی نامومڕاوی لە پارکێکدا خۆی دەکوژێت.

مریەم بێ ئارامانە هەستا و چەند جارێک بە ژوورەکەدا هات و چوو، لەناکاو وەستا و وتی: منیش جگە لە ناوێک، هیچی تر نیم؟

شێرزادیش بێئەوەی ڕاستەوخۆ وەڵامی بداتەوە، وتی: ئەوەی دەژی تەنها ناوەکانە، نەوەک کەسەکان. ناوەکان سێبەری ئێمە نین، بەڵکوو خودی خۆمانن. بەڵام تۆ تەنها کەسیت بزانێت شێرکۆ لە کوێیە؟ مریەم وای وت و بەرانبەر شێرزاد وەستا.

من لێتناشارمەوە، دوای کوشتنی ولیەم، شێرکۆ بەدوای سۆراخی ئەو جانتایەدا دەڕوات، کە بە خاوەنی کتێبخانەکەی سلێمانی بووە و لە مردنە نامومڕاوییەکەیەوە دیار نەماوە. گرنگی ئەو جانتایەش لەوەدایە چەند ڕاپۆرت و دەستنووسێکی لەبارەی کوشتنی چەند نووسەرێکەوە تێدایە. بەڵام ئەمە تەنها کاری شێرکۆ نابێت، بەوەی لەو گەڕانەیدا ڕێگای دەکەوێتە زۆر کتێبخانە و بەدوای ئەو کتێبانەشدا دەگەڕێت، کە لەلایەن نووسەرە نادیارەکانەوە، لە گۆشەیەکی کتێبخانەکاندا بەجێ دەهێڵدرێن، یاخود بەدوای نهێنی چارەنووسی ئەو نووسەرانەدا دەگەڕێت، کە لە ڕووداوی سەیردا دەکوژرێن، دوای ئەوەی کتێبێکیان بەدزییەوە نووسیوە. بەڵام لێشت ناشارمەوە کارەکەی شێرکۆ هێندە ئاسان نییە، بەڵکو کارێکی پڕ مەترسییە. بەوەی ئەو چۆتە ناو ئەو ڕووبەرە سامناکەوە، کە چەتەکانی خەیاڵ تیایدا چالاکن و بەدوای کتێبە نهێنییەکاندا دەگەڕێن و نووسەرەکانییان دەکوژن. وەک چۆن بە درێژایی مێژوو وایان کردووە. ولیەمیش ماوەیەک بوو، لەدوای تەقینەوەکەی شەقامی موتەنەبی و دیارنەمان و مردنی کتێبفرۆشەکەوە، هەستی کردبوو دەستەکەیان بەرەو ئاشکرابوون دەچێت، هەربۆیە بیری لەوە کردبووەوە یەکێک لە دەرەوەی

دەستەکەیان هەڵبژێرێت، تا بەدوای نهێنی کوشتنی کتێبنووسەکاندا بگەڕێت. بەلاشییەوە شێرکۆ بۆ ئەم کارە گونجاو بوو.

شێرکۆش دەکوژرێت؟ مریەم بە نیگەرانییەوە پرسیاری کرد و بێدەنگ چاوەڕوانی وەڵامی کرد. بەڵام شێرزاد هیچی نەوت. پاش کەمێک لە چاوەڕوانی، وتی: دەزانیت ناوەکان هەرگیز نامرن، بەڵکوو تەنها فەرامۆش دەکرێن. چونکە ئەوەی دەژی، ناوەکانە نەوەک کەسەکان. مرۆڤ بە سێبەری ناوەکەی خۆی دەکات و ئەوە مرۆڤە دوای ناوەکەی خۆی دەکەوێت. هەربۆیە من و تۆ و شێرکۆ و ولیەم و... دەژین، تا ئەوکاتەی فەرامۆش نەکرێین.

مریەم بەدەم گریانەوە بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت و وتی: نەدەبوو شێرکۆت بکوشتایە. لەناکاو گەڕایەوە و دەستنووسەکەی هەڵگرت، بەدەم سڕینی فرمێسکەوە وتی: دوای ئەوە چی ڕوودەدات؟

شێرزاد بەهەمان هێمنییەوە وتی: دوای ئەوە تۆ بیر لە سوتاندنی دەستنووسەکە دەکەیتەوە و لەناو هەموو ناوەکاندا، لەبارەی (ع.م)ەوە پرسیارم لێدەکەیت و دەتەوێت بزانیت کێیە.

***

# ڕازی ناوەکان
# بیرکردنەوە لە نووسینی ڕۆمانێك

کاتێک لە نووسیندا گەیشتمە ئەو شوێنەی مریەم دڵنیا دەبێت جگە لەناوێک، هیچیتر نییە و بیر لە سوتاندنی دەستنووسەکە دەکاتەوە و دەشیەوێت بزانێت ئەو ناوە کورتکراوەیە کێیە، کە بە دوو پیتی (ع.م) ئاماژەی پێدراوە و شێرکۆ بەش بەش دەستنووسەکەی خۆی بۆ ناردووە، لە نووسین وەستام.

ئێستا تۆش وا بزانە ئەوەی تا ئێستا من لە پێشەوە نووسیومە، تۆ هیچیت نەخوێندۆتەوە و فەرامۆشی بکە. بەسەرهاتی شێرکۆ و مریەم و دەستنووس و بکوژەکانیش فەرامۆش بکە و بیریش لە ڕازی (ع.م) مەکەرەوە، چونکە ئەویش ناوێکە وەک هەزاران ناویتر و دەشێت لە زەمان و شوێنی جیاوازدا، لە ژیانی جیاواز جیاوازدا بەرجەستە ببێت، بەپێی ئەو کەسانەی ئەندێشەی دەکەن و بیری لێدەکەنەوە. وەک چۆن تۆ ئێستا وا دەکەیت. هەموو ئەو شتانە فەرامۆش بکە و بیهێنە بەرچاوت، ڕۆژێکی پڕ باران، خۆت دەکەیت بە قاوەخانەیەکدا و مێزی یەکێک لە گۆشەکانی چۆڵە و سەرنجت ڕادەکێشێت. دەچیت لەوێ دادەنیشیت. دوای ئەوەی بە چواردەورتدا دەڕوانیت و بەدەم چاوەڕوانییەوە، ئەو کاغەزە هەڵدەگریت، کە لەسەر مێزەکە جێهێڵدراوە. وەک چۆن من وام کرد.

لە کاغەزەکەدا، هەندێک شت تێکەڵ و پێکەڵ نووسراون و کوژێنراونەتەوە. بەڵام بەڕوونی چەند ناوێک لە بەشی چەپی لاپەڕەکە لە شێوەی لیستێکدا نووسراون. لەسەرخۆ یەک یەک ناوەکان دەخوێنیتەوە و لەگەڵیدا بە خەیاڵ سیمایان دەکێشیت. وەک چۆن من وام کرد.

ناوی مریەم، هەلالە، ولیەم، شەوبۆ، شێرکۆ، ڕووناک و شێرزادی سەر پەڕەکە دەخوێنیتەوە، بێئەوەی بزانیت بۆچی لەوێدا نووسراون، بەخەیاڵ سیمایان دەکێشیت و وردە وردە هەریەکەیان ژیانێکیان لە خەیاڵتدا بۆ دروست دەبێت و هەروەک من و تۆ بەهەموو وردەکارییەکەوە دەژین. من وام کرد و هەریەکەیان بەوجۆرە ژیان، وەک پێشتر خوێندتەوە.

بەڵام ئێستا دەپرسیت: ئەی چارەنووسیان چی دەبێت؟ شێرکۆ بۆ کوێ دەڕوات و چی بەسەر دێت؟ دوای ئەوەی مریەم دەزانێت تەنها ناوێکە، چی دەکات؟ عەبدولخالق مەعروف پێش ئەوەی بکوژرێت، خەونی بە چ کتێبێکی ترەوە بینیوە؟ (ع.م) کێیە و چی لە دەستنووسەکەی شێرکۆ دەکات؟ بڵێی دەستەی کتێبنووسە نهێنییەکان لە کوێ بن؟

من وەڵامی هیچ یەکێک لەو پرسیارانە نادەمەوە و لە جێگای ئەوە، چەند لاپەڕەیەک بە سپێتی جێدەهێڵم، تا ئەگەر ڕۆژێک توانیت و ئارەزووت کرد ژیان ببەخشیتە ناوەکان، ئەوا بۆ خۆت وەڵامی ئەو پرسیارانە و هەر پرسیارێکیتر بدەیتەوە، کە لە خەیاڵتدان. یاخود لەوانەیە بیر لە نووسینی ڕۆمانێک بکەیتەوە، بەوپێیەی دەتەوێت ژیان و چارەنووسێکیتر بۆ ناوەکان بنووسیتەوە. ئەوکاتە لە نهێنیی (ع.م)ش دەگەیت.

# Eta Mihemed

## Rêberî Kitêbsaze Kujrawekan

Ebdulxaliq
Xewnî
Be Kitêbêkî Tirewe
Debînê






ISBN 978-1-63068-974-2

